

# پێگەی فەرموودە
# و
# حوجییەتی سوننەت

## لای عەللامە ناصرسوبحانی

د. عمر عبد العزیز

٢٠١٧

ناوی کتێب: پێگەی فەرمووده و حوجییەتی سوننەت لای عەللامە ناصر سوبحانی

نوسینی: د. عمر عبد العزیز

نەخشەسازیی : ناوەندی سارا

قەبارە : (١٤*٢١)، ١٠٧ لاپەڕە

نۆبە و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم/ ٢٠١٧

شوێنی چاپ : ناوەندی سارا _ سلێمانی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ : ٣٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن (١٣٥٢)ی ساڵی ٢٠١٧ ی پێدراوە

ناوەندی سارا

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی_بازاڕی ناوبازاڕ

0751 538 3505



## بڕگەو تەوەرەکانی ئەم بابەتە:

پێشەکیو ڕوونکردنەیەکی پێویست

**بڕگەی یەکەم:** شایەتیدانی شەخصیی نووسەر لەسەر تێڕوانینی مامۆستا ناصر لەسەر فەرمووده

**بڕگەی دووەم:** ڕوونکردنەوەکانی لەسەر پێگەی فەرمووده:

١ــ کتابو سوننەت دوو سەرچاوەی سەرەکیی (فیقه)ن

٢ــ پەیڕەویکردنی سوننەت واجیبه

٣ــ جیاوازیی قورئانو فەرموودەو فەرموودەی قودسی

٤ ـ تەفسیری ئایەتی (أطیعوا الله وأطیعوا الرسول وأولي الأمر منکم)

٥ــ ڕای مامۆستا ناصر لە جۆری (ئاحاد) لە فەرمووده

٦ــ پۆلێنو دابەشکردنی فەرمووده

٧ــ سەرچاوەکانی هیدایەتی خوایی

٨ــ حیکمەتو سوننەت یەك شتن

٩ــ قورئانو سوننەتو بڕیارەکانی ئەنجومەنی شورا، سێیانەی سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامین

- **بڕگەی سێیەم:** ڕاو سەرنجە تایبەتەکانی لەسەر زانستەکانی فەرمووده (علوم الحديث).

**بڕگەی چوارەم:** بیرۆکەکانی نامیلکەی (منكرة في علوم الحديث)

**بڕگەی پێنجەم:** ناوەرۆکی وانەکانی خواناسیی

# پێشەکی

ماوەیەکە لێرەو لەوێ، لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، یان لە هەندێك کۆڕی تایبەتو داخراوو نیمچە کراوەدا، کەسانێك کە پچڕ پچڕ گوێیان لە هەندێك وتاری مامۆستا ناصر سوبحانی گرتووە، یان ناو بەناو چاویان بە هەندێك لە نووسینەکانیدا خشاندووە، بە هەڵە، لە میتۆدو بیرکردنەوەی مامۆستا سوبحانی دەربارەی (پێگەی فەرمودە)و (حوجییەتی سوننەت) تێگەیشتوون، تا ئەو ئاستەی کە هەندێك کەس نابەرپرسانە ئەوە دەوروژێنن کە گوایە مامۆستا ناصر بڕوای بە حوجییەتی سوننەت نەبووە.

دیارە جگە لە هۆکاری بێئاگاییو نەخوێندنەوە، یان گوێنەگرتن لە وتارو وانەکانی مامۆستا ناصر، هۆکارێکی تر ئەوەیە کە بەڕێزیان بایەخی تایبەتی داوە بە قورئانی پیرۆز وەك (وەحی) خوای گەورەو سەرچاوەی بنەڕەتیی هیدایەتو تەشریع، سوننەتی پێغەمبەر خوایشی (دروودی خوای لەسەر

بێت)، بەڕوونکەرەوەو جێبەجێکردنی کردەیی تەعالیمی هیدایەتی قورئانیی داناوە.

بۆیە وەك بەرپرسارییەتێکی زانستیی‌و شەرعیی‌و مێژوویی ئەم قۆناغە، ئەم دەنگۆو وتی وتییە وای لیّ کردم کە دەست‌و برد بێمە دەنگ‌و ئەم دەسپێك‌و بەرکولە کورتە بخەمە بەردەستی خوێنەران، تا ئەگەر خوا تەمەن‌و مۆڵەتی دا، بە تێرو تەسەل تر بکەمەوە خزمەتی دۆستانی زانست‌و حەقیقەت.

بەندە بە حوکمی ئەوەی بۆ ماوەی نۆ ساڵ لە نزیکەوە ئەو زانا بلیمەتەم ناسیوەو لەبەر ئەوەی بۆ ئامادەکردنی تێزی دکتۆرا – کە ٨٠٠ لاپەڕەیەو لەسەر ژیان‌و بەرهەمەکانی مامۆستایە– بەدان لاپەڕەی بەرهەمەکانی‌و دەیان سەعاتی وانەو بابەتەکانیم لەبەرچاوەو ڕەنگە زیادەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێم: ئاگام لە هەموو بەرهە بیستراوو نوسرلوەکانی هەیە، بۆیە سەرەتا دلوا لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم کە بە متمانەوە ئەم بابەتە وەربگرن‌و ئەو کەسانەش کە جاروبار ناوی مامۆستا ناصر

تێکەڵ بە جەدەلیەتی بابەتی (ئیکتیفا بە قورئان)و (ڕەدکردنەوەی حوجییەتی سوننەت) دەکەن، ئەم بابەتە بە سەرچاوە بزانن.

پشت بەخوا لە ڕوونکردنەوەیەکو چوار بڕگەی ئەم بابەتەدا، چەندین بەڵگەی ڕوون دەهێنمەوە، بۆ ئەوە کە مامۆستا ناصر لە دوورو نزیك لەگەڵ ئەو بیرۆکەیە نەبووە: دوو بڕگەیان بۆ ئەو کەسانەی ئەگەری هەیە متمانەیان بە دیدو هەڵسەنگاندنی بەندە نەبێت، دووانیشیان بۆ هەر بەڕێزێك کە پێویستی بە دەستنیشان کردنو هێنانەوەی بەڵگەو نموونە لە خودی بەرهەمەکانی مامۆستا ناصردا هەیە.

# ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

خوێنەرانی بەڕێز!

بەندە بۆ ماوەی نۆ ساڵ ( لە ١٩٨١ تا کاتی دەسگیرکردنی و شەهیدبوونی) لە شارەکانی (پاوەو مەریوان و سنەو کرماشان)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لەگەڵ مامۆستا ناصر سوبحانی ژیاوم و ئاگام لە خوێندنەوەو نووسین و کۆڕی زانستیی و وانەوتنەوەکانی و ڕایەڵەی فکریی و هەڵس وکەوتی شەخصیی و کۆمەڵایەتیی و جۆری میتۆدی زانستیی و بیرکردنەوەکانی هەیە. دەیان سەعات گفتوگۆ لە نێوانماندا هەبووە، پێکەوە تاوتوێی دەیان بابەتی خیلافیمان کردووە، بە ڕوونیی و بێ پەردە باسی بیرۆکەی بیدعەی (ئیکتیفا بە قورئان)مان کردووە. بۆیە لەم ئامیلکەیەداو لە چەند خاڵێکدا بە پوختیی بۆچوونەکانی لەو بارەیەوە، پشت بە خوا دەخەمە ڕوو.

ئەو خاڵانەش کە ماندەرمن زۆر جار بەرگریی لە بیرو بۆچوونی ئەو زانایە بکەم، یان مۆڵەت بەخۆم دەدەم شرۆڤەی

بۆچوونەکانی بکەمو بیانخەمە ڕوو، ئەمانەی خوارەوەن، کە ئەگەر لەبەر پێویستیی نەبوایە، حەزم لێ نەبوو باسیان بکەم:

١ـ بەندە وەك لە سەرەتاشەوە وتم: بە درێژایی نۆ ساڵ – ١٩٨١ تا ١٩٨٩– لە نزیکەوە ئەو زانا بلیمەتەم ناسیوەو ئاگام لە گەشەی فکریی‌و ئاڵوگۆڕی بۆچوونو قەناعەتەکانی هەیە.

٢ـ جگە لەوە، بۆ ئامادەکردنی تێزی دکتۆراکەم – کە ٨٠٠ لاپەڕەیەو بە زمانی عەرەبییەو لەسەر ژیانو بەرهەمەکانی مامۆستا ناصرە–سەدان لاپەڕەی نووسینو بەرهەمەکانیو دەیان سەعاتی وانەو بابەتەکانیم لەبەرچاو بووەو ڕەنگە زیادەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێم: ئاگام لە هەموو بەرهە بیستراوو نوسراوەکانیو تەنانەت هەڵومەرجی خودییو کەشو هەوای بابەتیی وانەوتنەوەو نووسینەکانیشی هەیە.

٣ـ لەسەرێکی ترەوە –سوپاس بۆ خوا– شارەزای شێوە زمانەکەی ئەوو شێوەی (هەورامی)و هەردوو زمانی (عەرەبی)و (فارسی)م، کە وانەو وتارەکانی، بەو زمانو شێوانە

تۆماركردووەو زۆربەی نووسراوەكانیشی بە زمانی (عەرەبی)و (فارسی) نووسیوە.

هیوادارم ئەم سەرنجو خاڵانە بۆ خوێنەرانی بەڕێز هاندەر بن كە بە خەیاڵی ئاسوودەو متمانەوە ئەم چەند لاپەڕەیە بخوێننەوە.

# برگەی یەکەم

## شایەتیدانی شەخصیی نووسەر لەسەر تێڕوانینی

## مامۆستا ناصر لەسەر فەرموودە

لەم برگەیەدا بە کورتیی جەخت لەسەر چەند خاڵێکی تایبەت دەکەمەوە:

١ـ هەرگیزو لە هیچ قۆناغێکی ژیانی زانستیدا، مامۆستا ناصر سوبحانی (بیرۆکەی ڕەدکردنەوەی (حوجییەتی فەرموودەو ئیکتیفا بە قورئان)ی لەلا پەسەند نەبووە، بەڵکو بە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز دەیسەلماند کە (سوننەتی صەحیح)یش حوججەیەو بۆ هەندێك بواری ئەحکام کارپێکردنی واجیبە. ڕاستە لە سەرێکەوە هەمان بۆچوونی پێشەوا (ئەبو حەنیفە)و هەندێك لە زانایانی موحەققیقی هەبوو، کە بۆ بواری (عەقیدە)و (عبادات) کەمتر پەنای بۆ ڕیوایاتی (ئاحاد) دەبرد، لە سەرێکی تریشەوە مەرجی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ دروستیی‌و نادروستیی ڕیولیات، بەڵام ئەوەش بە ڕەهایی

نەبوو، وەك لە بڕگەی چوارەمدا بە ژمارەو نمونەو بەڵگەی ڕوون دەیسەلمێنین.

٢ـ بە پێچەوانەوە، ساڵی ١٩٨١ دەنگۆیەك پەیدا بوو بوو، كە گوایە هەندێ كەس لە گەنجانی ئیسلامیی پاش شۆڕشی ئێران، بیرۆكەی (ئیكتیفا بە قورئان)یان بۆ دروست بووە، دەنگۆكە ئەوەشی لەگەڵ بوو، كە لە خۆڕاو بە بێ بەڵگە بە ناوی كاك ئەحمەدی موفتیزادەوە– بەڕەحمەت بێت– ئەو باسە دەوروژێنن، گوایە پشتیان بەوە دەبەست كە كاك ئەحمەد لە وتارەكانیدا كەمتر بەڵگە بە فەرمودە دەهێنێتەوە، هەرچەند زۆربەی وتارەكانی كاك ئەحمەد، پاش قورئانی پیرۆز، هەڵقوڵاوی ڕۆح و جەوهەری فەرموودە بوون. لەبەر ئەوە چەند برایەك پێشنیاریان كرد كە كاك ناصر لەو بارەیەوە تێبینییەك بدات بە كاك ئەحمەد، تا خەڵكی نەشارەزا ئیستیغلالی ناوی بەرێزی نەكەن. بۆیە كاك ناصر هاوڕێ لەگەڵ كاك مەنصوری برای، سەردانی كاك ئەحمەدی كردو بە ئەدەبێكەوە پێی وت: كاك ئەحمەد، پێم باشە جەنابت تەحقیق و موتالەعەی زیاتر

لەسەر سوننەت‌و فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەیت، کاك ئەحمەدیش سوپاسی گەرمی کاك ناصری کردبوو لەسەر سەرنجەکەی‌و وتبووی: "بان چاو، کاکە ناصر، إن شاء الله".

٣- لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێم کە مامۆستا ناصر کەسایەتییەکی زانستیی کلاسیکی نەبوو، بە واتاو دەستەواژە ئیسلامییەکە (موقەللید) نەبوو، بگرە بە پێی تەعریف‌و پێناس‌و مەرجەکانی زانایانی (زانستی ئوصول)، کەسێکی موجتەهید بوو، نەك بە تەنها موجتەهیدی ناو (مەزهەبی شافیعی)، یان مەزهەبە موعتەبەرەکانی تر، بەڵکو موجتەهیدی دەرەوەی مەزهەبەکان بوو. واتە لەسەر بۆچوونە فیقهییەکانی هەموو مەزهەبەکان، ئیزافەو قسەو بۆچوونی نوێی هەبوو. هەروەها لەسەر بنەماو ڕێسا گشتییەکانی زانستە بنەڕەتییەکانی (أصول الفقه)و (علوم القرآن)و (علوم الحديث)، پێشنیارو سەرنجی نوێی هەبوو. لەمانەش گرنگ‌و سەیرتر ئەوەیە، هەرکەس گوێی لە وانەکانی شەرح‌و ڕاڤەی کتێبی (شذور الذهب) گرتبێت -کە (٩٧) وانەیە‌و لە چوار هەزار

لاپەڕەی (A٤)دا نووسراوەتەو چەند بەرگ کتێب دەردەچێت-تێبینی دەکات کە لە چەندین شوێندا ڕەخنە لە (ابن هشام) دەگرێت، بگرە هەڵەی ڕاست دەکاتەوە، لە کاتێکدا (ابن هشام) بە مامۆستای زمانی عەرەبی‌و پێشەنگی هەزاران زانای زمانزانی عەرەب دادەنرێت.[١]

بۆیە لەبەر هەمان هۆو لەهەمان سۆنگەوە، لەسەر زانستی (فەرموودەناسیی)ش قسەی هەبووە، وەك لەسەر زانستە شەرعی یەکانی تریش قسەو سەرنجو تێبینی خۆی هەبووە.

٤- دوا خاڵی ئەم برگەیە ئەوەیە کە بڵێم: بە پێی ئەو خاڵەی سەرەوە، مامۆستا ناصر سوبحانی زانایەکی ڕیفۆرمخوازو

---

[١] ناوی: عبد الله، جمال الدین، کوڕی یوسف، کوڕی ئەحمەد، کوڕی عبد الله، کوڕی (هشام)ی ئەنصاری میصرییە، ساڵانی: (٧٠١-٧٦١ ك/ ١٣٠٩-١٣٦٠ ن)، ژیاوە. نووسەری دەیان سەرچاوەی زمانەوانیی عەرەبییە، لەوانە (شذور الذهب)، کە بۆ خۆی مەتنەکەی داناوەو شەرحیشی لەسەر نووسیوە. مامۆستا ناصر ئەو کتێبەی زۆر بە لاوە پەسەند بوو، چونکە بەڵگەو نموونەی بە قورئان هێناوەتەوە، لەبەر ئەوەیشە کە لە شاکارێکی ناوازەدا لە (٩٧) سەعاتدا ڕاڤەی کردووەو لە چەند جێیەکیشدا ڕەخنەو سەرنجی لەسەری هەیە.

یەکێك لە پێشەنگانی ڕەوتی (ئیصلاحی فکری ئیسلامیی) بوو، سەرەڕای ڕێزی زۆری لە کلتورو (تراث)ی ئیسلامیی، بەڵام دژی چەقبەستوویی‌و دەمارگیریی مەزهەبیی بوو. لەگەڵ پێداچوونەوەی بنەما فیقهییەکان‌و داڕشتنەوەی هەندێك لە ڕێسا شەرعییەکان بوو. لەگەڵ ئەوەی دانان مەرجی بۆ ئیجتهادو موجتەهید قبوڵ بوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ داخستنی دەرگای ئیجتیهاد نەبوو. لەگەڵ ئەوەی بەڕێزەوە دەیڕوانییە زانایانی پێشین‌و هەوڵ‌و زەحمەتیانی دەترخاند، بەڵام سەرنج‌و ڕەخنەو زیادو کەمکردنیشی لەسەر زۆر شتیان هەبوو.

من پێم وایە ناسینی ئەو پیاوە گوێلێگرتنی ولنەکانی دەوێت، لەبەر گرفتی زمان‌و شێوەزارو خراپیی جۆری تۆماری دەنگەکانیش، گوێلێگرتنیشی حەوسەڵەو تاقەتی دەوێت، بۆیە زۆرجار پارچە گرتە دەنگییەکانی کە لە (یوتیوب)و (فەیسبووك) دادەبەزێنرێن، یان هەڵبژاردەی قسەکانی، کە لە لایەن هەندێك کەسانی دڵسۆزەوە بڵاو دەکرێنەوە، حەقی

تەواوی نادەن‌و مەبەستەکانی وەکو خۆی ناگەیەنن، بۆیە نابێت زانایان‌و زانستخوازان‌و تازە ئاشنایان لەوێوە بیناسن.

کە ئەمە دەڵێین ئەبێ ئاگامان لەوەش بێت کە مامۆستا ناصر نزیکەی (٧٠٠) کاتژمێر وانەو بابەتی تۆمارکراوی دەنگیی هەن، کە زۆر کەمیان سوودیان لێ وەرگیراوە، هەزاران لاپەڕەی نووسراویشی هەن، کە زۆر کەمیان چاپکراون، کە ئەگەر بە ڕێژەیی وەری بگرین، دەتوانم بڵێم: حەفتا لە سەدی بیرو بەرهەمەکانی، نەخراوەتە بەردەستی خوێنەران. کە ئەم خاڵە بۆ خۆی بەڵگەیەکی ترە کە نابێت بە پەلەکردن‌و بێ بەدواداچوونی وردو وردبوونەوە، بە ناوی ئەو زانایەوە قسە بکرێت.

## بڕگەی دووەم

## ڕوونکردنەوەکانی مامۆستا ناصر

## لەسەر پێگەی فەرموودە

مامۆستا ناصر لە چەندین بەرهەمی دەنگیی‌و نووسینەکانیدا، باس لە سەرچاوەکانی تەشریعی ئیسلام دەکات‌و لە تەواوی ئەو جێیانەدا ئاماژە دەکات بە قورئان (کتاب)و (سوننەت)و (بڕیارەکانی أولوا الأمر)، کە ئەو لەجێی دەستەواژەی (ئیجماع) دەستەواژەی بڕیاری (أولوا الأمر) یان (ئەنجومەنی شورا)، بەکار دەهێنێت، ئەوەش لەبەر ڕۆشنایی ئایەتی (أطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولي الأمر منكم). النساء/ ٥٩.

لێرەدا چەند لایەنێکی ڕاو بۆچوونەکانی لەو بارەیەوە دەخەمە ڕوو:

**١ـ کتاب‌و سوننەت دوو سەرچاوەی سەرەکیی (فیقه)ن:**

مامۆستا ناصر لە چەندین جێی نووسین‌و وانەکانیدا – لەسەر هەمان ڕەوییەی زانایانی پێشینی زانستی (أصول الفقه)–دووپاتی دەکاتەوە کە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەری

خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دوو سەرچاوەی سەرەکیی‌و بنەڕەتین بۆ دەرهێنانی ئەحکامی شەرعیی. بۆ نموونە لە وانە عەرەبییەکانی زانستی (أصول الفقه)دا دەڵێت: ".. ئەوە کە کتاب‌و سوننەت دوو بنەمان بۆ (فیقە)، ڕوونەو کەس گومانی تێدا نیە، مەگەر کەسێك لە بیرکردنەوەو عەقیدەیدا تووشی موصیبەتێکی گەورە بووبێت. !"[1]

٢- پەیڕەوی کردنی سوننەت واجیبە:

بۆ نموونە لە وانەکانی (سیستمی سیاسی)دا دەڵێت:

"... فەرمانێك کە لەناو کیتابدا نەبێت، بەڵام وەك سوننەت لە پێغەمبەری خوا (علیه السلام) دەربکەوێت، چ کردەیی، چ گوفتاری، پەیڕەوکردنی واجیبە. چونکە جیاوازیی فەرمانێك کە وەك (کیتاب) باسی دەکات لەگەڵ فەرمانێك کە وەك (سوننەت) باسی دەکات تەنها لە دەربڕینەکەدا جیاوازن، ئەگەرنا هەردووکیان لەبەر ئەوەی پاکن، ناگونجێت

[1] ڕەشنووسی وانەکانی زانستی (أصول الفقه) بە زمانی عەرەبی، ناصر سوبحانی، لا: ٢٤.

(پێغەمبەری خوا) فەرمانێك جگە لەوەی کە خوا دەیەوێت خۆی بیدات."[1] هەروەها دەڵێت: "ئەوەی کە بە تەواویی پەیڕەوی لێ دەکرێ (اللە)و (ڕەسول)ن، واتە: (کیتاب)و (سوننەت) ن، ئەڵبەتە سوننەتێك کە پشتڕاست کرابێتەوە، چونکە زۆر حەدیسش بە درۆ هەڵبەستراون، کە پسپۆڕان زەحمەتێکی زۆریان لە بارەیانەوە کێشاوە، لە سەدەی دووەم و سێیەم و چوارەمدا لێکۆڵینەوەی سەرسوڕهێنەریان لەبارەیانەوە کردووە. بۆ نمونە: (صەحیحی بوخاری) لە سوننەتدا باوەڕپێکراوترین کتێبە – بەپێی قسەی خودی بوخاری– لە (٦٠٠٠٠٠) (شەشسەد هەزار) ڕیوایەتدا، تەنها (٧٢٠٠) دانەی هەڵبژاردووە، جا حساب بکە چ نیسبەتێکی هەڵبژاردووە؟! کەواتە تەنها کیتاب و سوننەتن کە بە تەولویی پەیڕەوییان لێ دەکرێت."[2]

[1] سیستمی سیاسی ئیسلام، ناصر سوبحانی، دەزگای بەرهەم، ٢٠١٣، لا: ١٨٩.

[2] هەمان سەرچاوە، لا: ١٩٣.

### ٣ـ جیاوازیی قورئانو فەرموودەو فەرموودەی قودسی:

سەبارەت بە شێوەی پەیدابوونی فەرموودەو جیاوازیشی لەگەڵ دەقی قورئانو دەقەکانی فەرموودەی قودسی، مامۆستا ناصر سوبحانی دەڵێت:

"فەرمودەو حەدیسی نەبەوی: یانی حەدیسێك ـ کە پێغەمبەر خۆی بیڵێت ـ ماناکەی دەخرێتە زیهنی خودی پێغەمبەر (ﷺ)، دەربڕینەکەش خۆی وەك بەشەر هەڵی دەبژێرێت.. کەوابوو مەفهومەکەی هەر لە لایەنی خواوە دێت، بەڵام دەربڕین هی خۆیەتی. (کەواتە) لە ڕووی مەفهومەوە حەدیس خواییەو هەروەك قورئان پەیڕەوکردنی واجیبە، بەڵام لە ڕووی دەربڕینەوە لەبەر ئەوەی وەك بەشەرێك بەیانی کردووە، ئیتر ئەو حاڵەتە ئیعجازییەی نیە کە قورئان هەیەتی."[١]

[١] هەمان سەرچاوە، لا: ١٩٠

٤ ـ تەفسیری ئایەتی (أطیعوا الله وأطیعوا الرسول وأولي الأمر منكم):

بەڵگەی مامۆستا ناصر بۆ ئەوەی كە سوننەت سەرچاوەی دووەمی ئیسلامە، ئایەتی (أطیعوا الله وأطیعوا الرسول وأولي الأمر منكم)ە، بۆیە لە ژێر ناونیشانی گوێڕایەڵی لە پێغەمبەر (ﷺ) دا دەڵێت:

"تەفسیری ئایەتەكە: (أَطِيعُوا اللّه): گوێڕایەڵیی لە خوا بكەن، ئەوە دەبێتە گوێڕایەڵی لە كیتاب، هەروەها لە حەدیسی قودسی. (وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ): گوێڕایەڵی لە ڕەسول بكەن، كە دەبێتە سوننەت، جا سوننەتیش یان هەر قسەیەو فەرموویەتی: ئەوە بكەن و ئەوە مەكەن. یان كردارە، خۆی كردەوەیەكی ئەنجام داوە، یان كەسێكی تر ئەنجامی داوەو ئەو چاوی پێی كەوتووەو ڕەخنەی لێ نەگرتووەو فەرموویەتی: باشە، یان لەسەر ئەوە ڕازیبوونی پیشانداوە. ئەمانە بە گشتیی سەرچاوەكەیان خوایە، ئیتر بۆ بڕوادارن ئیختیاری پەیڕەوی لێكردن و پەیڕەوی لێنەكردن نیە. خوا لەمەدا

دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ واتە: کاتێک فەرمانێک لەلایەنی خواو پێغەمبەرەوە دەرچوو، بڕیارێک درا، پیاوو ژنانی بڕوادار ناتوانن هەست بە (سەرپشکیی)و ئیختیار بۆ خۆیان بکەن و بڵێن: کە ئارەزوومان بوو پەیڕەویی دەکەین، ئارەزوومان نەبوو، نایکەین."[1]

**٥ـ رای مامۆستا ناصر لە جۆری (ئاحاد) لە فەرموودە:**

لە درێژەی بابەتی پێشوودا مامۆستا ناصر دەڵێت: "فەرمودەکانی جۆری (ئاحاد) بۆچی ئەمێننەوە؟ دیارە ئەو جۆرە فەرموودانە، هەندێکیان بۆ ئەحکامی پەرەسەندوو، یان هەندێک ئەحکامی جێگیرن، کە لە قورئاندا بەیان نەکراون. ئەڵبەتە کە ئەڵێین بەیان نەکراون، نە بە واتای ئەوە کە بە هیچ جۆرێک باس نەکراون، باسی ئەحکامێکی جێگیرە کە لەبەر ئەوەی ڕوونکردنەوەی یەکجارییان بۆ هەمیشە کافییە، لە قورئاندا بە ئاماژە، ئاماژەیان بۆ کراوە، بەڵام پێغەمبەری خوا

---

[1] هەمان سەرچاوە، لا: ١٩١.

(ﷺ)دەرکی کردوون‌و ڕوونی کردوونەتەوە، ئیتر دوای ئەو، نیاز بەوە نەماوە جارێکی تر زەحمەت بکێشرێت بۆ ڕوونکردنەوەیان، بۆ نموونە: نوێژی نیوەڕۆ (٤) ڕکاتە، حەتمەن لە قورئاندا ئاماژە هەیە بۆ ئەمە، ڕەنگە پێغەمبەری خوا دەرکی کردبێ، بەڵام ئێمە ناتوانین لە قورئاندا دەرکیان بکەین‌و بیاندۆزینەوە.[1]

مامۆستا ناصر زۆرجار لە وتەو وێژو مونازەرەکانیدا دەیگوت: ئیمامی نەوەوەی گەورەزانای مەزهەبی شافعی لە چەندین شوێندا بە ڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە ڕیوایاتی ئاحاد گومان دەگەیەنن نەك عیلم. ئەمە بەلای هیچ زانایەکەوە گرفت دروست ناکات، بەڵام کە ئێمە قسەکەی (نەوەوی) دووبارە بکەینەوە لێمان دەکرێتە هەڵلا..

شایانی باسە پێشەوا نەوەوی لە پێشەکییەکەیدا بۆ شەرحی صەحیحی موسلیم، دەڵێت: "ئەو فەرموودانەی هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیم کە موتەواتەر نین، بە دڵنیاییی

---

[1] ناسخ‌و مەنسوخ، ناصر سوبحانی، دەزگای بەرهەم، ٢٠١٦، لا: ٥٥.

تەنها گومان دەگەیەنن، چونکە لە جۆری (ئاحاد)ن، ڕیوایەتی (ئاحاد)یش وەك (لای زانایان بڕیاردراوە) گومان دەگەیەنن. لەمەشدا هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان کتێبی صەحیحی بوخاری‌و صەحیحی موسلیمدا."[1]

ئەمەیشە وایکردووە کە پێشەوا (غەزالی)و (ئامەدی) لە پێناس کردنیانداْ بۆ ڕیوایەتی (ئاحاد) هەردووکیان بڵێن: "ما لا ینتهي من الأخبار إلى حد التواتر المفيد للعلم... خبر الواحد لا يفيد العلم"[2]، واتە: ئەو جۆرە هەواڵانەن (مەبەستی ئەو ڕیوایەتانەن) کە ناگەنە ئاستی تەواتورێك کە عیلم بگەیەنێت... هەواڵی یەك کەس زانست ناگەیەنێت. واتە: ئەو جۆرە ڕیوایەتانە گومان دەگەیەنن.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین: کاتێك کەدەگوترێت: ڕیوایەتی ئاحاد گومان دەگەیەنێت، مانای ئەوە نییە کە ڕیوایەتەکە لە پلەی

---

[1] شرح النووي على صحيح مسلم، ٢٠/١.

[2] المستصفى من علم الأصول، أبو حامد الغزالي، دار الأرقم، بيروت، ٤٣٣/١. هەروەها: الإحكام في أصول الأحكام، الآمدي، دمشق، ٢٠١٠، ٢٣٤/١.

(صەحیح)دا نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە وەکو ڕیوایەتی (موتەواتر) عیلمی یەقینی ناگەیەنێت، تاکو بەبێ ترس بیناى ئەحکامی گرنگی لەسەر بکرێت..

٦- پۆلێن و دابەشکردنی فەرمووده:

جگە لەمانە، مامۆستا ناصر لە وانەکانی (خواناسی)دا بە ڕوونیی لەسەر هەمان مەنهەجی زانایانی فەرموودە، پۆلێنی فەرموودە دەکات و دەڵێت: "فەرمودە لەڕووی پلەی بەهێزیی و لاوازیی (مەتن و سەنەد)ییەوە، یان (صەحیح)ە -کە ئەوە بەرزترین پلەیانە- یان (حەسەن)ـە کە مەرتەبەی دووەمە، یان (زەعیف)ە، یان هەندێ شتیش هەن فەرمودە نین، بە فەرمودە دانراون و پێیان دەڵێن: (موضوع - هەڵبەستراو)، کە (هەڵبەستراو) ئەصڵەن نرخ و ئەرزشی نیە، دەبێت تەنها بۆ ئەوە ڕیوایەت بکرێت کە باسی هەڵبەستنەکەی بکرێت. (زەعیف)یش بۆ ئەوە ناشێت کە پشتی پێ ببەسترێت، بەڵام (صەحیح)و (حەسەن) دەکرێت پشتیان پێ ببەسترێت، بە تایبەتی کاتێك ئەو مەوزوعەی فەرمودەکە باسی دەکات، لە

قورئاندا ئەصڵەکەی باس کرابێت و ئەو ببێتە ڕوونکردنەوە بۆ گۆشەیەك لە ئایەتەکە."[1]

۷ـ سەرچاوەکانی هیدایەتی خوایی:

لە باسێکی زانستیدا دەربارەی (پێشەکییەك لەسەر زانستی فەرمودەناسیی)، کە بە زمانی کوردیی تۆماری کردووە، بۆچوونی خۆی دەربارەی سەرچاوەکانی هیدایەتی خوایی دەردەبڕێت، کە ئەمە پوختەکەیەتی: "هیدایەتی بەشەر پێویستی بە کیتابی خوا – قورئان– و سوننەتە. سوننەت عیبارەتە لە چۆنییەتی جێبەجێکردنی عەمەلیی و دەرهێنانی کیتاب لەم لایەنانەی ژیاندا:

لایەنی فەردیی: لە ژیانی فەردیی پێغەمبەری خوادا.

لایەنی خانەوادەیی: لە ژیانی پێغەمبەر خۆی و خێزانەکانیدا.

لایەنی کۆمەڵایەتیی: لە ژیانی خۆی و سابقینی ئەووەلین لە کۆچبەران و یاریدەراندا..

---

[1] ڕەشنووسی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥١٢.

کەواتە ئەو شتانە کە فەردین لە ئەحکام، خۆی ئەنجامیان دەدات، یان لای خواوە دانی پێدا نراوەو تەئکید کراونەتەوە، یان خەتایەك ڕووی داوەو ئیصلاح کراوە. بە کورتیی زیندەگیی فەردیی خۆی، دوای ئەو تەهزیبو تەقریرە، بووەتە سەرمەشق. لەوەیشا کە ژیانی جەمعی ئیجماعییە، خۆی بە تەنیاو سابقینی ئەووەلین بە جەمعیی، سەرمەشقن، بەڵام خۆی لە بەشی مەسائیلی فەردیدا، وەك فەردیش، سەرمەشقو ئیمامە."[1]

٨ـ حیکمەتو سوننەت یەك شتن:

جیاوازلە هەموو زانا ناسراوەکانی زانستی فەرموودەناسیی، ئەوەندەی من ئاگادار بم بۆ یەکەم جار، مامۆستا ناصر ئاماژە دەکات بەوەی مەبەست لە چەمکی (حیکمەت) -کە لە قورئانی پیرۆزدا (٢٠) جار دووبارە بووەتەوە- سوننەتی فەردیی و دەستەجەمیی پێغەمبەری خواو یارانیەتی. بۆیە لە زۆر جێی وانەو نووسینو وتارەکانیدا سوننەتو حیکمەت بە یەك شت دادەنێت. لەو لایەنەوە حیکمەت دەکاتە سێ

---

[1] بە کورتیی لە شریتی دەنگیی (مقدمة في علوم الحديث) وەرگیراوە.

بەشەوەو دەڵێت: "حیکمەت: مەبەست پێی جێبەجێ کردنی بنەما گشتییەکانە، بۆ هەر بنەمایەك جۆرێك جێبەجێکردن هەیە، وشەی (حیکمەت) مانای سوننەتیش دەگەیەنێت، کە دەکرێت بە سێ جۆرەوە:

**جۆری یەکەم:** حیکمەت یان (سوننەت)ی فەردیی: ئەم جۆرەیان تایبەتە بە شەخصی پێغەمبەرەوە. ئەم سوننەتە بۆ ئێمەش ماوەتەوە، کە بە فەردیی بیکەین، وەك ڕۆژوو، نوێژ.. هەموومان بە تاکیی دەیانکەین، خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً﴾ الأحزاب/ ٢١.

**جۆری دووەم:** حیکمەت یان سوننەتی ناو خێزان: ئەم بەشە تایبەت بووە بە پێغەمبەری خواو خێزانەکانییەوە، بۆیە دەبێت ئێمەش (لە ژیانی خێزانیدا) وەکو ئەو بجوولێینەوە کە بە دەستمان گەیشتووە.

**جۆری سێیەم:** حیکمەت یان سوننەتی جەماعی: ئەم سوننەتانە پێغەمبەری خوا لەگەڵ (السابقون الأوّلون)

تەتبیقیان دەکردن، چونکە بە تەنیا ناکرێت بۆ نمونە: زەکاتو قتالو.. هتد."[1]

مامۆستای شەهید ئەم تێڕوانینەی دەربارەی (سوننەت) لە دەیان جێی تردا، بە داڕشتنو گوزارشتی جیاواز، دەربڕیوە، کە لە دەرەنجامدا ئەوە دووپات دەکاتەوە

کە سوننەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێت)، پاش قورئانی پیرۆز، سەرچاوەی دووەمی هیدایەتی خواییە بۆ مرۆڤەکان. وەك کتێبی (الأسس والتصورات)و (مقدمة في علوم الحديث)و (وانەکانی عەقیدە)و (الإمامة والولاية)و (خەلقی ئادەم) و (شریتەکانی بانگەواز)و.. هتد. بۆ نموونە لەمەی دواییاندا کە باس لە گرنگیی قورئان دەکاتو جەخت دەکاتەوە کە دەبێت بانگخواز لە پرۆسەی بانگخوازییدا، قورئان بکاتە سەرچاوەی یەکەمیی، بە دوایدا دەڵێت: "ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە سوننەت ئیهمال بکرێت، لە شوێنی خۆیدا

[1] ڕەشنووسی وانەکانی بانگەواز، ناصر سوبحانی، لا: ٤٦.

ئەمیش دەوری خۆی هەیە، دەبێت ئیهتیمامی خۆی پێ بدرێت."[1]

لەمە زیاتر لە چەند شوێنێکی وانەکانیدا، قورئانی پیرۆز دەچوێنێت بە نەخشەیەکی ئەندازیاریی بنەڕەتییو پێغەمبەری خواش بەو ئەندازیارەی کە لە ڕێی (سوننەت)ەوە پرۆژەکەی جێبەجێ کردووەو دارشتنەکەی تەواو کردووە. بۆیە لە زنجیرە وانەکانی ناسراو بە (عەقیدە)دا دەڵێت: "سوننەت یانی: ڕەوشتو ڕێڕەو شوێنی پێغەمبەری خوا کە جیاواز نیە لە قورئانو ئەویش پیادەکردنی قورئانە. بۆ نموونە وەک نەخشەیەک بۆ بینایەک کە لەسەر کاغەز دادەڕێژرێت، دواتر ئەندازیارێک دێت بە پێی ئەو نەخشەیە، بیناکە دروست دەکات. دەی نەخشەکەو ڕێڕەو شوێنەکە کە ئەندازیارەکە بۆ دروستکردنی بیناکە ئەیگرێتە بەر، لەیەک جیا نینو وەک یەکن."[2]

---

[1] ڕەشنووسی وانەکانی بانگەواز، ناصر سوبحانی، ل: ٤٩.

[2] ڕەشنووسی زنجیرە وانەکانی (عەقیدە)، ناصر سوبحانی، ل: ٣١.

### ٩ـ قورئان‌و سونئەت‌و بڕیارەکانی ئەنجومەنی شورا، سێ کوچکەی سەرچاوەکانی ئیسلام:

مامۆستا ناصر سوبحانی لە دەیان وانەو نوسراوو وتاریدا، جەخت لەسەر ئەو ناونیشانەی سەرەوە دەکاتەوەو پێی وایە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی تەشریع لە ئیسلامدا بریتین لە: (قورئان)و (سوننەت)و (بڕیارەکانی شورای ئوممەت). دیارە بۆ هەموویان شیکردنەوەی خۆی هەیەو لەسەر هەرکامیشیان – سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ زۆربەی زانایانی پێش خۆی هاودەنگە– بەڵام لەسەر زۆرێك لە قسەو بۆچوونەکانیشیان سەرنج‌و زیادو کەمکردنی خۆی هەیەو لەو بەرهەمانەیدا کەتاییەتن بە سێ زانستە سەرەکییەکەی (علوم القرآن)و (أصول الفقه) و (علوم الحديث)، تۆماری کردوون.

بۆ نمونە لە بابەتەکانی (علوم القرآن)دا: لە باسی (ناسخ‌و مەنسوخ)و (أسباب نزول)و زۆر جێی تەفسیری ئایەتەکانی ئەحکامدا، هەندێك جار ڕای جیاوازی هەیە لە زانایانی پێشین، هەروەها لە زانستی (فیقه)دا زۆرجار سەرنجی لەسەر جۆری

هەڵێنجانی ئەحکام لە قورئان و سوننەتدا هەیە لە لایەن زانایانەوە.

یان لەزانستی (أصول الفقه)دا: لەسەر بابەتەکانی دەقەکانی قورئان و سوننەت و حوجییەتیان، جیاوازیی دەخات لە نێوان دەقی (قطعي الدلالالة) و (ظني الدلالة)دا لە قورئانداو دەقی (قطعي الثبوت)و (ظني الثبوت)، یان (ظني الدلالة) لەسوننەتدا.

ئەو دوو بابەتە بەدەرن لە تەوەرەکانی ئێمە، بۆیە لێیان نادوێم و نموونە ناهێنمەوە، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ بەرهەمەکانی مامۆستا ناصر لەو بوارەدا، تا ئاشنا ببێت بە ڕاو بۆچوونە جیاوازەکانی و پێشنیارەکانی بۆ چاکسازیی لە مەنهەجیەتی نووسینەوەی ئەو زانستانەو تەدریسکردنیاندا. بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە زانستی (علوم الحديث)ەوە ئەم برگەیەی داهاتووی بۆ تەرخان دەکەم.

## برگەی سێیەم

### ڕاو سەرنجە تایبەتەکانی مامۆستا ناصر

### لە زانستی ( علوم الحدیث ) دا

مەعلومە کە مامۆستا ناصر چەند ڕاو سەرنجو پێشنیارێکی جیاوازی لە زانستی (فەرموودەناسی)دا هەن، کە ئامانجی لە باسکردنیان زیاتر دەوڵەمەندکردنی زانستەکەو زیاتر تۆکمەکردنی سەرچاوەکانی تەشریعە، بە کورتی ئەمانەن:

١ـ لە ڕووی حوجییەتی ئەو جۆرە لە فەرموودانەوە کە زانایانی موحەققیق ناویان ناون (خبر الآحاد): جیای کردوونەتەوە لە جۆری (متواتر)و پێی وایە بۆ بابەتی بنەماکانی (اعتقادیات) و بابەتە گشتییەکانی (عبادات)، قورئانی پیرۆز ڕووماڵی کردوونو دەکرێت پشت بە جۆری دووەمی سوننەتیش ببەسترێت، کە ئەوە ڕای زۆرێکی تر لە زانایانی پێشینیشە، بە تایبەتی لە ئەحنافەکان.[1]

---

[1] خوێنەر دەتوانێت گوێ لە زنجیرە وانەکانی زانستی (أصول الفقه)و (علوم الحدیث)و (ناسخو مەنسوخ)ی مامۆستای شەهید بگرێت، کە بەدرێژیی ئەم خاڵەی ڕوونکردووەتەوە.

٢- له دیاریکرنی سەرچاوەکانی تەشریعدا: هەروەك پێشینان ڕای جۆراوجۆریان هەیەو لە دابەشکردنیاندا چەند ڕێبازێکیان هەیە، ئەمیش ڕێبازی تایبەت بەخۆی هەیەو پێی وایە سەرچاوە سەرەکییەکانی تەشریع سیانن: (قورئان)و (سوننەت)و (بڕیارەکانی ئەنجومەنی شورا)، یان (أولوا الأمر)، یان (أهل الحَلّ والعَقْد)، کە هەموو ئەم دەستەواژانەی لەقۆناغی جیایای نووسینو وانەکانیدا بەکار هێناوە.

دیارە ئەو جۆری سێیەمە (واتە بڕیاری ئەنجومەنی شورا)ی لە جێی (ئیجماع) داناوە، کە زانایانی پێشینی زانستی (أصول الفقه) وەك سەرچاوەی سێیەمی تەشریع، لە ڕیزی (الأدلة الشرعية الأساسية) دایاننناوە، کە زانایانی هاوچەرخ دەستەواژەی (مصادر التشريع)یشیان بۆ بەکارهێناوە. دیارە کاك ناصر قەناعەتی وا بوو کە ئەو ئیجماعەی خودی زانایانی (أصول الفقه) پێناسەیان کردووەو مەرجیان بۆ داناوە، لە سەدەی یەکەمی ئیسلامیشدا -بە هۆی پرژو بڵاوبوونی صەحابەو دواتر (تابعی)یە فەقیهەکانەوە لە شارو دەڤەرە

جیاجیاکانی سەرزەوی ئیسلامدا– ڕێك نەکەوتووە، تا بگاتە سەردەمەکانی دوای ئەوان، یان ئەم سەردەمە هاوچەرخەی ئێمەش.[1]

٢ ـ لە بەشی زانستی (إسناد)یش لە زانستی (علوم الحدیث) لە سەر دەستەواژەی (صەحابی) قسەی هەیەو پێی وایە کە دەبێت لەبەر ڕۆشنایی ڕێنوێنی قورئاندا، جیاوازیی بخرێت لە نێوان دەستەی یەکەمی (پێشڕەوانی یەکەمین) لە کۆچبەرانو یاریدەران (السابقین الأولین من المهاجرین والأنصار)و یارانی پەیماندەری ژێر درەختی (الرضوان)و ماڵبەخشەرانی پێش ئازادکردنی مەککە، لەگەڵ دەستەکانی تری هاوچەرخی ئەوانو دوای ئەوان.

جگە لەوەش لە واتاکردنی وشەی (صەحابی) ڕای وابوو کە هەر لە خودی وشەکەوە دەردەکەوێت کە دەبێت ئەو کەسەی

---

[1] مامۆستا ناصر ئەم بابەتەی لە دەیان جێی بەرهەمەکانیدا ڕوون کردووەتەوە، لەوانە: سیستمی سیاسی ئیسلام، وانەکانی عەقیدە، وانەکانی بانگەواز، مونازەرە..

ئەو نازناوەی پێدەدرێت بۆ ماوەیەك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ژیا بێت، یان لای کەم هەڵسوکەوتێکی گونجاوی لەگەڵ کردبێت‌و بەهرەمەند بووبێت بە پلەی هاوڕێیەتی ئەو زاتە، دیارە وشەی (صوحبە)ش بە واتای هاوڕێیەتی، ئەو مەرجە دەخوازێت. بۆیە لەگەڵ پێناسی زۆرینەی زانایان نەبوو بۆ صەحابی، کە وتوویانە: (من رآه رسول الله، أو رآه هو، مؤمنا)[1] واتە: هەرکەس بە موسڵمانیی پێغەمبەری خوا بینیبێتی، یان ئەو پێغەمبەری بینیبێت، درودی خوای لەسەر بێت.

لەم لایەنەشەوە مامۆستا ناصر ئەوە دەردەخات کە ئەمە بە تەنها بۆچوونی ئەو نیەو پێش ئەو زانایەکی گەورە بە ناوی (باقلانی) هەمان ئەو بۆچوونەی هەبووەو وتوویەتی: "صەحابە

---

[1] بڕوانە: نامیلکەی: مذکرة في علوم الحدیث، ناصر سوبحانی، لا: ٣٠.

کەسێکە مولازەمەی پێغەمبەری خوای بووبێ‌و زۆر لەخزمەتیا بووبێت" درودی خوای لەسەر بێت.[1]

٤ ـ لەسەر هەمان بیرکردنەوە، قەناعەتی وابوو کە (تابعی)ش دەبێت مەرجی (اتّباع بالإحسان)ی بۆ صەحابەی (پێشڕەوانی پێشین) تێدا بێت، ئەمە بە دەقی قورئان کە دەفەرموێت: (والذین اتّبعوهم بإحسان) لە ئایەتی: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ التوبة:/١٠٠.

٥ ـ سەبارەت بە مەرجەکانی (مەتن)ی فەرموودە:

لەم لایەنەوە مامۆستا ناصر لەچەندین شوێنی نووسین‌و وانەکانیدا، هەوڵی زانایانی پێشینی فەرموودەناسی نرخاندووەو کارەکانی ئەوانی لە زانستی (علوم الحدیث)دا

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی: باسێك دەربارەی (أصول الفقه)، ناصر سوبحانی، لا: ٥١. ئەو پێناسەی (باقلانی)ش بۆ (صحابی) لە کتێبی (الکفایة)ی خەتیبی بەغدادی، لا: ١٠٠ دا، هاتووە.

بەکارو مەنگاوی گرنگ ناوبردوون،[1] بەڵام سەرنجیشی لەسەر ئەو مەرجانە هەبوو کە دایانناوەو پێی وابوو مەرجێکی گرنگو بنەڕەتیی گوێی پێ نەدراوە، کە ئەویش (بەراوردکردنی دەقی ڕیوایەتە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا)و ڕەدکردنەوەی ئەو ڕیوایەتانەیە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان، پێچەوانەی دەقێکی قورئانی پیرۆزن، هەرچەند لە ڕووی سەنەدیشەوە قسە لەسەر ڕاوییەکان نەبێت.

لەو بارەیەوە پێی وابوو کە تەواوی ئەو ڕاستییانەی کە دەبێت مرۆڤی موسڵمان باوەڕیان پێ بێنێت، لەگەڵ تەواوی ئەو باسانەی (تەرغیب) و (تەرهیب) کە بۆ گەشەپێدان (تەزکیە)ی دەروونی مرۆڤ پێویستن، لەگەڵ ڕێبازو پایەکانی (عەمەلی صالح)، هەموویان لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، بۆیە هەر ڕیوایاتێك لەو بوارانەدا هەبوون، ئەگەر گونجاو بوون لەگەڵ ئەو ڕاستییانە، وەردەگیرێن، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەی یەکێك لەو ڕەهەندە قورئانییانەوە بوو، دەبێت ڕەدبکرێنەوە.

٦ــ زیادکردنی مەرجێك بۆ (راوی) لە سەنەدی فەرموودەدا:

---

[1] بۆ نموونە: لە وانەکانی خواناسی، نامیلکەی (مذكرة في علوم الحديث)، وانەکانی عەقیدەدا.

مامۆستا ناصر سوبحانی لەبەر ڕۆشنایی خوێندنەوەیەکی وردی سۆسیۆلۆژیی- کۆمەڵایەتیی ڕووداوە مێژووییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی یەکی کۆچیی، تا سەدەی سێیەم -کە دەکرێ ناوی لێ بنێین سەردەمی فیتنەی تاقمو فیرقە مەزهەبییەکان- ڕای وا بوو کە دەیان ڕیوایەتخوانی فەرموودەسازی درۆزن، کە کاسەلێسی میرو والییەکان بوون- بە تایبەتی لە ناو شامییو کوفییەکاندا- پەیدا بوونو هەزاران ڕیوایەتیان بە ناوی پێغەمبەری خواوە، دەربارەی گوێڕایەڵیی زاڵمو خۆسەپێنەران هەڵبەستووە.

بۆیە مامۆستا ناصر پێی وابوو کە دەبوایە لەگەڵ مەرجی (عدل)و (ضبط) - کە زانایانی فەرموودە وەك دوو فیلتەری بنەڕەتیی بۆ (راوی) دایانناونو بە لایەوە دوو مەرجی زۆر گرنگو مەنهەجین- مەرجێکی تریان دابنایە کە ئەوەیە: (راوی) فەرموودە نابێت لەو کەسانە بووبێت کە هاتوچۆی لای میرو سوڵتانو والییەکانی کردووە، مەگەر سەلمابێت کە بە مەبەستی چاکسازیی (ئیصلاح)، یان ئامۆژگاریی چووەتە لایان.![1]

[1] بڕوانە ئامیلکەی: مذکرة في علوم الحدیث، ناصر سوبحانی، لا: ٢٤.

خۆ ئەگەر کاتی خۆی ئەو مەرجە ڕەچاو نەکراوە، ئێستەش دەکرێت لە هەوڵەکانی کۆکردنەوەی فەرموودەدا، یان سەرلەنوێ پێناسکردنەوەی (صەحیح)و (زەعیف)دا- بۆ ئەو ریوایەتانەی کە ئیشکالیان تێدا بەدی دەکرێت-ئەو مەرجە لەبەرچاو بگیرێت، چونکە دەیان سەرچاوە بۆ دەرهێنانی ژیاننامەو مێژووی کەسییەتی ڕاوییەکان لەبەر دەستان، وەك: (العلل ومعرفة الرجال)ی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵو (الضعفاء والمتروكون)ی (دارەقوطنی)و (الضعفاء والمتروكون)ی نەسائیو (الضعفاء)ی ئەصبەهانیو (المغني في الضعفاء)ی زەهەبیو.. دەیان کتێبی تری لەم بابەتە، کەژیاننامەو هەڵسەنگاندنی زۆربەی ڕاوییانیان تێدایە.

٧- بڕوانەبوونی بە نەسخی قورئان لە فەرموودە:

یەکێکی تر لە ڕاو بۆچوونەکانی مامۆستا ناصر لە بواری ڕێسا زانستییەکانی (فەرموودەناسیی)دا، لە بارەی بابەتی نەسخ کردنەوەی قورئان بوو بە فەرموودەو ریوایات، کە بە داخەوە ڕای هەندێك لە زانایان وایە - لەوانە قەولێك لە مالکیو هەندێك لە حەنەفییەکانو هەندێك لە زانایانی ئەهلی کەلامو زاهیرییەکان- کە سوننەتی موتەواتر قورئان نەسخ

دەكاتەوە.[1] بەڵام ئەو زۆر بە دڵنیاییەوە ئەوەی بە هەڵەیەكی مەنهەجیی دەزانی‌و پشتیوانیی لەو ڕایەی دووەم دەكرد كە بڕوای بەو جۆرە نەسخە نیە – لەوانە پێشەوا شافیعی– زۆربەی جاریش بەڵگەی بەم ئایەتە دەهێنایەوە، كە لەو بارەیەوە هیچ گومانێك نامێڵێتەوە، دەفەرموێت: ﴿مَا نَنْسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنْسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرة/ ١٠٦. واتە: هیچ ئایەتێك نەسخ ناكەینەوە، یان لەبیری نابەینەوە، مەگەر لەو باشتر، یان هاوشێوەی دێنین، ئایا نازانی كە بە ڕاستی خوا دەسەڵاتی زۆرە بەسەر هەموو شتێكدا..؟

---

[1] بۆ زانیاریی لەسەر ئەم بابەتە بڕوانە:( إرشاد الفحول)ی شەوكانی: ٢ /٧٠. مناهل العرفان في علوم القرآن، محمد الزرقاني: ٢ /٢٤١.، الإحكام في أصول الأحكام، ابن حزم: ٤/٥٠٥.

## بڕگەی چوارەم

### بیرۆکەکانی نامیلکەی (مذکرة فی علوم الحدیث)

مامۆستا ناصر -وەك زۆرێکی تر لە زانایانی موحەققیق- لە وانەو وتارو نووسینەکانیدا نەیشاردۆتەوە کە تێبینی تایبەتی خۆی هەیە لەسەر میتۆدو مەنهەجیەتو ڕێبازی زانایانی فەرمووده، وەك دەیان جار خۆم لێم بیستووەو گفتوگۆمان دەربارەی ئەو باسانە کردووە.

بەڕێزیان تا ساڵی ١٩٨٥ سەرنجو پێشنیارەکانی بۆ چاکسازیی لە زانستی (أصول الفقة) و (علوم الحدیث)دا، تەنها لە وانەکانی خۆیو هەندێك کۆڕی تایبەتی خۆماندا دەوروژاند، بە تایبەتی لە وانەکانی زانستی (أصول الفقه)دا. دواتر بۆ یەکەم جار بەشێك لە سەرنجو تێبینییەکانی لەو بوارانەدا لە شریتەکانی ناسراو بە (مونازەرە)دا بۆ ڕای گشتیی خستنە ڕوو، کە بۆ یەکەم جار بوو، گۆمی مەنگی کۆڕی خوێندەوارو هەندێك حوجرەو مەلاو زانایانی شڵەقاندو دۆستانی لە ڕادەی زانستییو

توانای کەموێنەی سەراسیمە بوونو نەیارانیشی تووشی حەپەسانو شۆک کرد.[1]

---

[1] ئەو مونازەرەیە گفتوگۆیەکی (١٢) سەعاتییە، کە بە دوو قۆناغ لە کۆتایی (مانگی موردادو سەرەتای شەهریوەری ساڵی ١٣٦٤)ی هەتاوی، (کۆتایی ئابو سەرەتای ئەیلول)ی ساڵی ١٩٨٥زاینی، لە نێوان مامۆستا ناصر سوبحانیو مەلایەکی موتەصەویفی ناوچەی (مەریوان)دا ڕووی دا. ئەم مەلایە کەم تا زۆرێك ناوی مامۆستا ناصری بیستبوو، زانیبووی مامۆستا ناصر لە شوێنێکی نەزانراوی شاری سنە، دوور لە چاوی دەزگا ئەمنییەکانی میریی، دانیشتووە، بۆیە تەحەددای کرد مامۆستا خۆی بۆ دەربخاتو بکەوێتە مونازەرەی زانستیی لەگەڵیو وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە. دیارە ئەو مەلایە پێشبینی ئەوەی کردبوو کە ڕەنگە لەبەر بارە ئەمنییەکە مامۆستا ناصر خۆی دەرنەخاتو سەرەنجام ئەمیش تەحەدداکەی بۆ بچێتە سەر..! بەڵام برایان کۆڕەکەیان ڕێکخستو مونازەرەکە کراو ئەوەند لە سەدی کاتەکە بووە ڕوونکردنەوەی کاك ناصرو بەرامبەرەکەی لە حازرزیهنییو زانستی فراوانی مامۆستا، سەرسامو دەستەوسان بوو.. سەیر ئەوە بوو، نە کاك ناصرو نە ئێمەش نەمانئەزانی کە ئەو مەلایە چ داواو پرسیارانێکی ئامادە کردووە.! ئەو موناز‌ەرەیە، لەو بابەتانەیە کە هەر زانستخوازێك پێویستە گوێیان لێ بگرێت.

دواتر ساڵی (١٩٨٥ن) ژمارەیەك گۆڤاری (المسلم المعاصر)ی قەتەریمان دەست کەوت، کە باسی لە پڕۆژەیەك کردبوو بە ناوی: (مشروع موسوعة الحدیث النبوي)، بە سەرپەرشتی بەڕێز د. یوسف قەرەزاوی، لە سەنتەری (بحوث السیرة والسنة النبویة) لە زانکۆی قەتەر. مەبەست لە پڕۆژەکە نووسینەوەی سەرلەنوێی تەواوی فەرموودەو بە ئەلیکترۆنی کردنی بوو. ئێمە لەو کاتەدا پڕۆژەکەمان خوێندەوەو دوایی دامانە مامۆستا ناصرو داوامان کرد کە بیخوێنێتەوەو پێشنیارمان کرد کە داواو سەرنجو پێشنیارەکانی بنێرێت بۆ ئەو دامەزراوەیەو د. یوسف قەرەزاوی، وەك هەڵێکی هەڵکەوتوو، هەم بەمەبەستی جێبەجێکردنی تەکلیفی زانستییو شەرعیی، بەرامبەر بەو پرۆژەیە، هەم بۆ ناساندنی کاك ناصر بە بەشێك لە ناوەندە زانستییە عەرەبیو ئیسلامییەکان.

بەهەرحاڵ کاك ناصر قەناعەتی کرد دەستبەرد یاداشتنامەیەکی بۆ دامەزراوەی پەیوەندیدار نووسی، کە بوو بەو کتێبە بە ناوی (مذکرة في علوم الحدیث)، کە بە ژمارە (٣)ی زنجیرەی چاپکراوی عەرەبی بەرهەمەکانی مامۆستا ناصر، لە لایەن دەزگای (بەرهەم)ەوە چاپو بڵاوکراوەتەوە.

شایانی باسە لە یەکێك لە وانەکانی (أصول الفقه)دا ئەم باسە دەکاتو بایەخو گرنگیی پرۆژەکەش دەعاتە ڕوو و دەڵێت: "مەتالیبێك هەبوون وتم بیاننوسم بۆ (قەرزاوی)، کە مەوسوعەیەکیان هەیە، (موسوعة السيرة والسنة)، یان (السنة والسيرة النبوية)، کە شتێکم دی... وتوویانە: ئەمانەوێ مەوسوعە دابنێین، کارێکی زۆر گەورەیە، (١٧) کتێبی مەشهوری (سوننە) هەرچیان تێدایە هەمووی جەم بکرێتەوە، کتێبێکە ئەگەر (تەدوین) بکرێ، زۆر زۆر موهیممە، ئینسان موستەغنی ئەبێت لە هەموو کتێبانی تر... ئێستا نازانم گەیشتوونەتە کوێ، تا لە کوێوە دەست پێ بکەمو چۆن..؟"[١]

بەهەرحاڵ، پێش هەر شتێك، ئەو کارە خۆی بۆ خۆی مشوورو خەمخۆریی مامۆستا ناصر بوو، بۆ خزمەت بە زانستی فەرموودە، بەو پێیەی کە زانایەکی موجتەهید بوو، پێی وابوو بەو کارەی، بەشێك لە ئەرکی زانستیی سەرشانی، لە قۆناغی هاوچەرخدا جێبەجێ دەکات.

لەو نامیلکەیەدا ئەم خاڵانەی خوارەوە بەدی دەکەین کە ئەوە دەسەلمێنن مامۆستا ناصر دژی بیرکردنەوەی (ئیکتیفا

---

[١] ڕەشنووسی وانەکانی (أصول الفقه)، ناصر سوبحانی، لا: ٥٥.

به قورئان) بووەو (سوننەت)ی بە سەرچاوەی دووەمی تەشریع زانیوە:

١ـ لە پێشەکییەکەدا داوا دەکات کە سەرپەرشتیارانی پرۆژەکە بە جورئەت بن‌و تەقلیدی موجتەهیدەکان‌و ئیجیتیهادی موقەللیدەکان تێپەڕێنن، چ بگات بە تەقلیدی موقەللیدەکان..!

٢ـ داندەنێت بە زانستی (علوم الحدیث)دا‌و هەوڵی زانایانی ئەو زانستە دەنرخێنێت‌و داوا لە بەرپرسانی پرۆژەکە دەکات کە وریا بن‌و هەڵە پێشووەکان دووبارە نەکەنەوە.

٣ـ حیکمەت بەشێکی لە قورئاندایە، بەشێکی لە گوتارو ڕەفتارو دانپێدانانی پێغەمبەری خوادایە، چ لە بەشە تاکە شەخصییەکەیدا، یان بەشی خێزانیدا، یان بەشە کۆمەڵایەتی یەکەیدا لەگەڵ یارو هاوەڵانی.

٤ ـ وەك پێشتر وتمان (حیکمەت)و (سوننەت) لای ئەو یەك شتن. بەڕوونی لەو نامیلکەیەدا دەڵێت: "کە زانیمان حیکمەت بریتییە لە ڕێگەی میانەو دروست لە جێبەجێکردنی بنەماکانی کاری چاك‌و دروست، (العمل الصالح)دا، هەروەها ژیاننامەو سوننەتی پێغەمبەر بریتین لەو ڕێگەیە، ئەو کاتە بۆمان

دەردەکەوێت کە حیکمەت لە سەرێکەوەو سیرەتو سوننەت لە سەرێکی ترەوە، یەك شتن."[1]

٥- کاك ناصر پێی وایە پرۆسەی تەزکیەی دەروونو چەسپینو بە مەلەکەبوونی ڕەوشتە بەرزەکانو سەرەنجام ڕەنگدانەوەیان لە عەمەلە صالیحەکاندا، ڕێك ناکەوێت بە دوو شت نەبێت؛ یەکەم: بە وەرگرتن لە قورئانی پیرۆزەوە. دووەم: بە چاولێکرنو پەیرەوی کردنی ژیاننامەی فەردیی‌و جەماعیی پێغەمبەرو یارو هاوەڵانی، کە بەشێکی لە قورئاندا هەیەو بەشێکیشی دەبێتە سوننەت.

٦- پاشان بۆ (مەتن)و دەقی فەرموودە، باس لەوە دەکات کە مەرجێك زیاد بکرێت، ئەویش بریتییە لە گەڕان بۆ پاڵپشتی قورئانیی‌و دۆزینەوەی هەر ئەسڵێکی قورئانیی، لەو بابەتانەدا کە فەرموودە باسی کردوون، زۆر پێویستە، بەو پێیەی فەرموودە ڕوونکەرەوەی قورئانی پیرۆزە.

٧- پاشان بۆ ئەو (پێوەر)و پێودانگانەی زانایانی فەرموودە دایاننناون، بۆ بواری (سەنەد)ی ڕیولیە -واتە هەڵسەنگاندنی

---

[1] نامیلکەی (مذکرة في علوم الحدیث)، ناصر سبحانی، لا: ٢٩.

کەسییەتی ڕاوییەکان– مەرجێکی زیاد کردووەو دەڵێت: نابێت (ڕلوی) هەر فەرموودەیەك لەو کەسانە بێت کە هاتوچۆی سوڵتان‌و میرو والییەکانی کردووە، مەگەر بە نیازی ئامۆژگاریی !

٨– هەروەها باس لەوەش دەکات کە دەبێت لەبەر ڕۆشنایی چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا، پۆلێنی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (علیه وعلیهم صلوات الله وبركاته) بکرێت، لە نێوان پێشەنگانی یەکەم لە کۆچبەران‌و یاریدەران‌و بەیعەتدەرانی ژێر درەختی (الرضوان)، لەگەڵ غەیری ئەوان، لە سامان بەخشەرانی پێش فەتحی مەککەو پاش ئەوان. لە گیان بەختکەرانی سەرەتاو موسڵمانە دواکەوتووەکانی ساڵی (عام الوفود)و دواییەنەکان.. ئەمەش نە بە پاڵنەری گومان دروست کردن لەسەر کەسییەتی صەحابە، بەڵکو بۆ پۆلێن کرنی فەرموودەو دیاریکردنی ڕادەی بەهێزیی‌و لاوازیی واتاو مەدلولوکەی، وەك حەقیقەتێك کە قورئان وێنای کردووە.

٩– لەسەر ئەو ڕێساو بنەمایەی سەرەوە، پێی وابوو هەر ڕاوییەکی سەردەمی صەحابە کە لە گێڕانەوەی فەرموودەیەکدا

وتوویەتی: (سمعت رسول الله)، واتە: لە پێغەمبەرم بیست، دەبێت لێکۆڵینەوە لە ژیاننامەی بکرێت، بزانرێت لەوانەیە کە لەگەڵی ژیاوەو لە فەزڵی (صوحبەت)و هاوڕێیەتی بەهرەمەند بووە، یان جارێك ڕاگوزەر بینیویەتی؟! لەوێشدا دووپاتی دەکاتەوە کە هەموو ئەو صەحابانە لە ڕیزی کۆمەڵی صالیحانداناو بۆ گومان دروستکردن نیە لەسەر کەسیان، بەڵکو ئەم ئیحتیاتە لەبەر ئاینی خوا پێویستە. !

١٠- دواجار داوا دەکات لە بابەتی زانستی (جەرح‌و تەعدیل)دا -کە بەشێکی گرنگ‌و هەستیاری زانستی فەرموودەناسییەو پەیوەندیی بە هەڵسەنگاندنی کەسییەتی ڕاوییەکانەوە هەیە- پەیڕەوی لە ڕێبازی توندگیرەکان بکەن، ئەوانەی کە مەرجی توندوتۆڵیان هەیە، نەك شلگیرەکان، ئەوانەی کە لە دانانی مەرجەکاندا دەستیان دانەگرتووە. مەگەر لە کاتێکدا گومان ببرێت کە ملەجەڕی‌و دەمارگیریی‌و زیادەڕەویی هەیە.

١١- لە بەشێکی یاداشتنامەکەیدا هەڵەیەکی باوو بەربڵاو ڕاست دەکاتەوە، کە زانایانی پاش پێشەوایان (بوخاری‌و موسلیم)

سەبارەت بە دوو کتێبی هەردووکیان کە پاوەڕپێکراوترین سەرچاوەی فەرموودەن‌و ناویان ناون (الجامع الصحیح)- وتوویانە: ئوممەت ئیجماعی هەیە کە (أصحّ کتابین بعد کتاب الله)، واتە دروستترین دوو کتێبن پاش قورئان. دەڵێت: ڕاستە ئەمە وتراوە، بەڵام ئەم لافلێدانی ئیجماعە، بەو جۆرە کە ڕیوایەتی لاوازیان تێدا نەبێت، ڕاست نیەو خودی دوو پێشەواکە خۆیان بەرامبەر یەکتر وایان نەزانیوە.[1] و زانایانی پاش ئەوانیش هاودەنگ نەبوون کە هەرچییان تێدایە لە جۆری (صەحیح)ن.

ئەم ڕاستییەی سەرەوە لای ئەهلی تەحقیق جێی گومان نیە، چونکە بۆ نموونە: کەسێکی وەك (دارەقوتنی) لەسەر چەندین ڕیوایەتی

---

[1] ئەوەی ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت ئەوەیە کە خودی پێشەوایان (بوخاری‌و موسلیم) لەسەر مەنهەجیەتی کۆکردنەوەی فەرموودەو مەرجەکان یەك ڕا نەبوون، بۆیە لە هەندێك ڕیوایەتدا هاودەنگن، کە پێیان دەگوترێت: (متفق علیه)، لە هەندێکیشیاندا (موسلیم) ڕیوایەتە لاخراوەکانی (بوخاری) هێناونەتەوە، ئەوانەن کە پێیان دەگوترێت: (ما انفرد به مسلم)..!

(بوخاری) قسەی هەبووەو لەو بارەیەوە (الإلزامات والتتبّع)ی نووسیوە.

یان موحەددیسی گەورە (ابن حجر العسقلانی)کە خۆی ڕاڤەی (صەحیحی بوخاری) کردووە لە کتێبە نایابەکەیدا بە ناوی (فتح الباری) لە چەندین شوێندا ئاماژە بە لاوازیی هەندێك ڕیوایەتی بوخاری دەكات، هەروەها (ابن الجوزی)و کەسانێکی تر لە زانایانی پێشین‌و دوایین قسەیان لەو بارەیەوە کردووە.

# برگەی پێنجەم

## ناوەرۆکی وانەکانی خواناسیی

بەدەر لەوەی کە مامۆستا ناصر سەدان جار لە وانەکانیدا باس لە فەرموودەو -بە گشتیی باس لە- سوننەت دەکاتو تیۆریزەی بۆچوونو سەرنجەکانی خۆی دەکات، دەمەوێ لەم برگەیەدا بە کردەیەکی (ئیستقرائیی)، تەنها یەك زنجیرە وانەی بە نموونە بێنمەوە، کە (٢٢) سەعات وانەکانی (خواناسی)نو لە کتێبێکی (٨٠٠) لاپەڕەیی قەبارە گەورەدا نوسراونەتەوەو لەلایەن (دەزگای بەرهەم)ەوە تەکلیف کرام بە پێداچوونەوەی و وردبینیی و هەڵەچنیی و پشت بەخوا بەم نزیکانە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

لێرەدا تەنها ئەم کتێبە دەکەم بە نموونەو ئەوەندەی بۆم بکرێتو بۆم بگونجێت بە ژمارەو ناونیشان، تەواوی ئەو جێیانەو تەوەرەکان دەخەمە بەردەستی خوێنەران، کە مامۆستا ناصر تیایاندا فەرموودەی هێناونەتەوەو کردوونیەتە

بەڵگەی شەرعیی، وەك ڕونكردنەوەی چەند حەقیقەتێكی قورئانیی. لەگەڵ هەندێك لە وتەكانیشی لەسەر ئەو فەرموودانە:

ئەمەی خوارەوەش ئەو نموونانەن كە لە كتێبەدا هاتوون:

١ـ بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی كە هەندێك خەو (ڕۆیا) مژدەدەرو (مبشّر)ن‌و دەكرێت دڵیان پێ خۆش بكرێت.

لەو بارەیەوە مامۆستا ناصر دەڵێت: "لە بارەی خەوەوە فەرموودە هەیە، كە ناوی ناوە (مبشّر)، ڕوئیای موژدەدەرو دڵخۆشكەر،[1] یانی ئینسان لە ڕێگەی خەوەوە جارجار ڕوحی پەیوەندیی پەیدا دەكات لەگەڵ وەقایع‌و كەسانێكدا تەنانەت، لەگەڵ ئەرواحی مردوواندا، مەعلوماتێك بەدەست دەهێنێت... شێوەیەكی یەقینیبوونیان نیە، بەڵكو لە حەددی گوماندان،

---

[1] لەو بارەیەوە چەند فەرموودەیەك هەن، وەك: (أيُّهَا النَّاسُ إنَّهُ لمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أوْ تُرَى لَه..)، سونەنی نسائي، بە ژمارە: ١٠٤٤. سونەنی ئەبوداوود، بەژمارە: ٨٧. سونەنی ئیبن ماجە، ٣١٦١. یان: (رُؤْيا المؤمنِ جزءٌ من ستَّةٍ واربعينَ جزءًا منَ النُّبوَّةِ)، صەحیحی بوخاری، بە ژمارە: ٦٩٨٨، صەحیحی موسلیم، بە ژمارە: ٢٢٦٣، صەحیحی ترمذي، بە ژمارە: ٢٢٩١.

تەنها حەقی ئەوەیە کە دڵی پێخۆش بکات، بەڵام ئیتر هیچ حوکمێکی لەسەر دانامەزرێت.."[1]

٢- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە بێباوەڕانی پێش ئیسلام ڕۆژووی عاشورایان دەگرتو نەزریان دەکرد:

لەمەدا مامۆستا ناصر دەڵێت: "لە فەرمودەی صەحیحدا هەیە کە (موشریکەکانی پێش ئیسلام) ڕۆژووی عاشورایان دەگرت، وەك نەزرو.. هتد."[2]

٣- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە نزاو هاوارکردنە خوای گەورە، ڕۆحو کرۆکی عیبادەتو پەرستشە:

لەمەشدا ئەم ڕیوایەتە دەگێڕێتەوە، کە دەفەرموێ: (الدعاءُ مُخّ العبادة)[1]، مامۆستا دەڵێت:"ئەم فەرمودەیە ماناکەی

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خوداناسیی، ناصر سوبحانی، ل: ٣٦٢.

[2] مەبەستی ئەم نموونە فەرموودانەیە: (.. صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ) موسلیم، بە ژمارە: ١١٦٢. هەروەها (ابن عباس) خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێت: (مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَحَرَّى صِيَامَ يَوْمٍ فَضَّلَهُ عَلَى غَيْرِهِ إِلا هَذَا الْيَوْمَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ..) بوخاری، بە ژمارە: ١٨٦٧.

زانراوه، یانی: مەغزو کرۆکی عیبادەت‌و بەندەیی، بریتیە لە (دوعا)، لەبەر ئەوە: یەکەم: (عیبادەت) بریتیە لە جووڵەیەک کە ئینسان لە ژیانیدا دەیکات، لە پەیوەندیی لەگەڵ خواو غەیری خوادا.

دووەم: هەر (حەرەکەت)ێکیش کە ئینسان دەیکات بریتییە لە گرتنەبەری هۆکارێك لە هۆکارەکان‌و ڕێکخستنی زەمینە بۆ گەیشتن بە سەرەنجام."[2]

٤- بەلگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر بەسەرهاتی پەیکەرو بتە مەشهورەکانی عەرەب، کە قورئانی پیرۆز باسیان دەکات: (وەد، سواع، یەغوث، یەعوق، نەسر)، کە ناوی پیاوچاکان

---

١ ئەم دەقە لەم سەرچاوەیەدا هاتووە: (جامع الترمذي)، بە ژمارە: ٣٣٧١، بەڵام ئەلبانی وتوویەتی سەنەدەکەی لاوازە. دەقێکی تر بەم جۆرە هاتووە: (الدعاء هو العبادة)، کە لە سوننەنی ئەبوداود، بە ژمارە: ١٤٧٩و سوننەنی ترمذی، بە ژمارە: ٢٩٦٩ بە سەنەدی صەحیح، ڕیوایەت کراوە.

٢ ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٢١٦.

بوون‌و دواتر پەیکەریان بۆ دروستکراوەو پاشان نەوە دوای نەوە کراونەتە تکاکارو هاوەڵی خولو هاواریان لێ کراوە.

کاک ناصر دەڵێت: "لە فەرمودەیەکی صەحیحی (بوخاری)دا نەقڵ دەکرێت لە (ابن عباس) (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە ئەو (پێنج) بتە کە لە زەمانی پێغەمبەر (نوح)دا (علیە الصلاة والسلام) هەبوون (وەد، سواع، یەغوس، یەعوق، نەسر)، ئەفەرموێت: (هذه أسماء رِجال صالحين من قوم نوح، فلما هَلَكُوا أوحى الشيطانُ إلى قومهم أن ينصِبوا إلى مجالسهم التي كانوا يجلسون فيها أنصاباً، وسمّوها بأسمائهم، ففعلوا، فلم تُعبَد حتى إذا هلك أولئك، وتنسّخ العلمُ عُبِدَت)[١]، واتە: ئەم پێنج بتە زووتر ناوی (پێنج) پیاوی صالح بوون -پێش لە زەمانی پێغەمبەر (نوح)- کە پێشەواو سەرمەشق بوون بۆ خەڵکەکە. کاتێك ئەوانە مردن‌و (زانست‌و عیلم سڕرایەوە)، شەیتان

---

[١] ئەم فەرمودەیە لە: صحيح البخاري ، كتاب: تفسير القرآن، سورة نوح، باب: ودّاً ولا سُواعا ولا يَغوث ويَعوق ونَسْرا، بە ژمارە: ٤٦٣٦، هاتووە.

وەسوەسەی خستە دڵی خەڵکەکەوەو خستییە مێشکیان کە لەو مەجلیسانەدا ئەوان تیایدا دادەنیشن (پەیکەر)و موجەسسەمەو یادبود بۆ ئەمانە دروست بکەن، بۆ ئەوەی هەمیشە لە بیریان بکەنەوەو ڕێگەی چاکەو صەلاحی ئەوان درێژە پێبدەن."[1]

٥- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، لەلایەن فریشتەی ڕاسپێردراوەوە دەبرێتە خزمەتی:

مامۆستا ناصر لەو بارەیەوە دەڵێت: "لەوانەیە هەندێ کەس لە فەرمودەیەك کە لە بارەی صەڵاواتداندا ڕیوایەت کراوە بکەونە هەڵەوە، کە دەفەرموێ: هەر کەس صەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) -یانی دوعای خێری بۆ بکات بەو عیبارەتە مەعروفە- لە هەفتەیەکدا یەك ڕۆژ ئەو صەڵاواتە دەرێتە خزمەتی‌و بۆی باس دەکرێت. مەلائیکەی مەئموری ئەو کارە دەیبەنە لای، کە فلان کەس ئەوەندە دوعای خێری بۆ تۆ

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٢٧٦.

کردووه، ئەوەندە صەڵاواتی لەسەر تۆ داوە.[1] ئەگەر دیققەت بکرێت لە لەفزی فەرمودەکەدا هیچ جۆرە کێشەیەك پەیدا

---

[1] ئەوەی مامۆستا ناصر مەبەستییەتی، لە دەیان ڕیوایەتدا هاتووە. بۆ نموونە لە ڕیوایەتێکدا کە بەیهقی لە (أبو أمامة)وە گێڕاوییەتەوە، نموونەی یەکەم باس دەکات‌و تیایدا هاتووە: "صلاة أمتي تُعرَض عليّ في كل يوم جمعة). یان ڕیوایەتێکی تر کە (البزار) گێڕاویەتەوە، هاتووە: (إن الله وكّل بقبري مَلَكا أعطاه أسماء الخلائق، فلا يُصلّي عليّ أحد إلى يوم القيامة، إلا أبلغني باسْمِهِ واسم أبيه: هذا فلان بن فلان قد صلّى عليك). بەڵام هەندێك ڕیوایەتی تر هاتوون کە باس لەوە دەکەن پێغەمبەری خوا گوێی لێیە، هەموو ئەوانەیان یان لاوازن، یان هەڵبەستراوو ناڕاستن. عەللامە ئەلبانی لەم بارەیەوە لە (السلسلة الضعيفة، ١/٣٦٦)دا دەڵێت: "ئەو ڕیوایەتەی کە ئەوەی تێدا هاتووە: "من صلّى عليّ عند قبري سَمِعْتُهُ.."واتە: هەرکەس لەسەر گۆڕەکەم صەڵەوات لەدیدارم بدات، گوێم لێیەتی، ڕیوایەتێکی هەڵبەستراوە.. (ابن الجوزی)یش لە (الموضوعات، ١/٣٠٣)، وتوویەتی: "ڕاست نیە". بۆیە هەر ڕیوایەتێك باس لەوە بکات کە پێغەمبەری خوا گوێی لێیە، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە. (ابن تيمية)یش وتوویەتی: کەسێکی زۆر درۆزن بەناوی (محمد بن مروان) لەو ڕیوایەتەدایەو ڕیوایەتەکە درۆو هەڵبەستراوە. بۆیە: هیچ زانایەك ئەو باسەی نەکردووە، (ئەوە کە پێغەمبەری خوا گوێی لە صەڵەواتدان بێت)، بەڵکو هەندێك لە

نابێت، چونکە دەفەرموێ: مەلائیکە ئەو صەلاواتە دەبەن‌و باسی دەکەن بۆی، نافەرموێ: ئەو صەلاواتەکە دەبیستێت، دەفەرموێ: دەیبەن پێشکەشی دەکەن بە ڕوحی ئەو، بەو جۆرە کە تایبەت بە ڕۆح‌و پێشکەشکردن بە ڕۆحە، بەم ڕێگەیە لە فەرمودەکەدا باسنەکراوە کە ئەگەر صەلاوات درا، لە قەبرەکەیدا دەیبیستێت."[1]

٦- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) تەڵقینی مردووانی لە جەنگی بەدردا کردووە، بەڵام ئامۆژگارییەکانی بە گوێی زیندووەکاندا داوە:

مامۆستا ناصر سوبحانی دەڵێت: "فەرمودەیەکی تر ڕیوایەت کراوە لە بارەی کوژراوانی جەنگی (بەدر)، لە دوای ئەوەی (حەفتا) نەفەر لە سەرانی کوفر کوژران، خستنیانە ناو

---

نەفامەکانی ئەم دواییە ئەو باسەیان داهێناوە، کە ئەوە قسەیەکی پووچە. ئەوەی کە هەیە تەنها ئەوەیە کە صەڵەوات لەسەری‌و سەلام لێکردنی، پیشانی دەدرێت‌و فریشتەی ڕاسپێردراو پێی دەگەیەنن." (مجموع الفتاوى، ٢٧/٢٤١).

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٣١٢.

چالێکەوە بەناوی (قەلیبی بەدر) و پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە سەریان‌و یەکە یەکە بە ناوی خۆیان بانگی کردن: (أبا جهل، عەتبە، شەیبە، رەبیعە..)!، فەرمووی: (هل وجدتم ما وعدكم ربكم حقا؟ فقد وجدتُ ما وعدني ربّي حقا)،[1] واتە: ئەرێ ئێوە ئەوەی کە خوا پەیمانی پێدان بە ڕاستیی دەستان کەوت؟ من ئەوەی کە پەروەردگارم پەیمانی پێدام، دەستم کەوت. یەکێك لە موسڵمانانی صەحابەی (بەدر) پرسیار دەکات: ئایا مەگەر ئەوانە دەبیستن، کە تۆ قسەیان لەگەڵ دەکەیت؟.. ئا لێرەدا وەڵامێك دەداتەوە کە لە وەڵامەکەیدا

---

[1] ئاماژەیە بەو ڕیوایەتە کە ئەمە بەشێکیەتی: (..أيسرّكم أنكم أطعتم الله ورسوله؟ فإنّا قد وجدنا ما وعدنا ربّنا حقاً، فهل وجدتم ما وعد ربكم حقاً؟ فقال عمر: يا رسول الله، ما تكلّم من أجساد لا أرواح لها؟ فقال رسول الله (ﷺ): والذي نفس محمد بيده، ما أنتم بأسمع لما أقول منهم". صەحیحی بوخاری، كتاب المغازي، باب: قتل أبي جهل، بە ژمارە: ٣٩٧٦، هەروەها صەحیحی موسلیم، بە ژمارە: ٢٨٧٥.

کێشەیەك لە گواستنەوەکەیدا پەیدا بووە،[1] عبد الله کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) لەو ساڵەدا منداڵ بوو، ڕۆیشت بچێت بۆ جەنگی (بەدر)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕاندییەوە، فەرمووی: تۆ منداڵی، ڕێگەت پێ نادەم بێیت. کەواتە عبد الله لەوێ ئامادە نەبووە، ئەو کەسەی وەڵامەکەی گێڕاوەتەوە، هەڵەیەکی لە نەقڵەکەدا کردووە. بۆیە دایکی ئیمانداران (عائیشە) ڕاستی دەکاتەوە. لە جامعی صەحیحی بوخاریدا هەڵەکەی (عبد الله کوڕی عومەر)و ڕاستکردنەوەکەی (عائیشە)ش (خوا لە هەموویان ڕازی بێت) هەیە، بەڵام حەیف ئەوانەی کەدەیانەوێت بەویستی خۆیان سوودوەربگرن، بەشی

---

[1] ئاماژەیە بەو ڕیوایەتە کە ئەمە بەشێکە لە دەقەکەی: (...أیسرّکم أنکم أطعتم الله ورسوله ؟ فإنّا قد وجدنا ما وعدنا ربنا حقاً، فهل وجدتم ما وعد ربکم حقاً؟ فقال عمر: یا رسول الله، ما تکلّم من أجساد لا أرواح لها؟ فقال رسول الله (ﷺ): (والذي نفس محمد بیده، ما أنتم بأسمع لما أقول منهم). صەحیحی بوخاری، کتاب المغازي، باب: قتل أبي جهل، بە ژمارە: ٣٩٧٦، هەروەها صەحیحی موسلیم، بە ژمارە: ٢٨٧٥.

یەکەم لە فەرمودەکە دەگێڕنەوە، بەڵام ڕاستکردنەوەکەی دایکی ئیمانداران (عائیشە) باسناکەن.

جا، (ابن عمر) دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا فەرمووی: (وەنەبێ ئێوە باشتر لەوان ئەم قسەیەی من ببیستن)، یانی ئەوانیش وەك ئێوە دەیبیستن. کەوابوو ئەگەر ئاوا بێت، ئیتر مردوو شت دەبیستێت، بەڵام دایکی ئیمانداران (عائیشە) دەفەرموێ: (ابن عمر) هەڵەی کردووەو لێی تێکچووە! پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ئێستا ئەوانە دەزانن ئەوەی کە من وتم حەقەو بۆیان ڕۆشن بووەتەوە)،[1]

---

[1] مەبەستی مامۆستا ئەو ڕیوایەتەیە کە بەم جۆرەیە: (ذُكِر عند عائشة أن ابن عمر يرفع إلى النبي (ﷺ) أن الميت يُعَذَّب في قبره ببكاء أهله عليه. فقالت: وَهَلَ. إنما قال رسول الله: إنه لَيُعَذَّبُ بخطيئته أو بذنبه، وإن أهله لَيَبْكُون عليه الآن.) صحيح البخاري، ٥/٣، كتاب المغازي، باب قتل أبي جهل. وصحيح مسلم، كتاب الجنائز، باب الميت يعذب ببكاء أهله عليه، الحديث رقم ٢٦٦. لە ڕیوایەتێکی تری صەحیحی موسیلمدا دەڵێت: (عائیشە وتی: رَحِمَ اللهُ أبا عبد الرحمن، سَمِعَ شيئًا فلم يَحفَظه.

واته: مەبەستی ئەوە نەبووە کە دەنگی من دەبیستن، یانی ئێستا گەیشتوون بە مەتڵەبو بۆیان ڕوون بووەتەوە کە ئینزارم دەکردن بە عەزاب لە دوای مەرگ، ئێستا حاڵیان بووە. ئەمە غەیری ئەوەیە کە بڵێت: دەنگی من دەبیستن. دایکی ئیمانداران (عائیشە) پشت بە ئایەتێك دەبەستێت، کە باسی ئەوە دەکات ئەوانەی کە لە ناو قەبردان دەنگ نابیسن. ئەوە کە لە سورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ ۝٢٢﴾: تۆ ئاوا نیت کە بتوانیت دەنگ بگەیەنیت بە گوێی ئەوانەی کە لە ناو قەبرەکاندان."[1]

٧- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ بە نیەتی قەتعیی لەسەر کاری خراپ سزا دەدرێت، وەك نمونەی بکوژو کوژراوێك کە نیازی کوشتنی یەکتریان هەبووە:

---

إنما مرّت على رسول الله ((ﷺ) جنازة يهودي، وهم يبكون عليه، فقال: أنتم تبكون، وإنه ليُعَذّب)، صحيح مسلم، ج ٢/ ٦٤٢، الحديث رقم ٢٥.

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خولناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٣١٢-٣١٥.

مامۆستا ناصر دەڵێت: "وەك ئەو فەرمودەیەی کە دەفەرموێ: (ئەگەر دوو موسڵمان گەیشتن بە یەك، شمشێریان کێشا بۆ یەکتر، هەر دووکیان -قاتلو مەقتول- لە جەهەننەمدان. پرسیار دەکەن بۆچی مەقتول لە جەهەننەمدایە؟ دەفەرموێ: چونکە ئەویش دەیویست قاتیلەکە بکوژێت، بەڵام ئەو دەستی خۆی پێشخست)،[1] بەڵێ لە دونیادا قاتڵ نیە، چونکە قەتڵێك ڕووی نەداوەو (قیصاص) مەترەح نابێت، بەڵام لە قیامەتدا قاتیلە."[2]

٨- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە (المغضوب علیهم) جوولەکەنو (الضالّین) نەصاران: مامۆستا

---

[1] مەبەست ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرموێت: (إذا التقی المسلمان بسیفیهما، فالقاتل والمقتول في النار. فقیل: یا رسول الله هذا القاتل، فما بال المقتول؟! قال: إنه کان حریصاً علی قتل صاحبه)، کە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري، کتاب الفتن، باب إذا التقی المسلمان بسیفیهما)، بە ژمارە ٦٦٧٢. هەروەها: (صحیح مسلم، کتاب الفتن وأشراط الساعة، باب إذا تواجە المسلمان بسیفیهما..) بە ژمارە: ٢٨٨٨.

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٣٣٤.

ناصر دەڵێت: "لە تەفسیری ئایەتی (غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ)دا ڕیوایەت کراوە،[1] کە (ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ) یەهودن‌و (ٱلضَّآلِّينَ) نەصاران.[2] بەڵام دواتر تێبینی دەدات کە ئەوان وەك نموونە باسکراون.

٩- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە هەرکەس سوێند بە غەیری خوا بخوات تووشی شیرك بووە:

لەو بارەیەوە مامۆستا ناصر دەڵێت: "لە فەرموودەیەکدا کە (ترمذی) (رحمه الله) ڕیوایەتی دەکات‌و پلەی (حەسەن)ی پێدەدات، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ

---

[1] ئامازەیە بە ڕیوایەتێك کە بە چەند ڕێگایەك هاتووە: وەك ئەوەی پێشەوا ئەحمەد لە ڕێی خۆیەوە لە(عدی بن حاتم) دەیگێڕێتەوە. دەڵێت: (سألت رسول الله (ﷺ) عن قول الله: غير المغضوب عليهم؟ قال: هم اليهود، ولا الضالين؟ قال: النصارى هم الضالون. جگە لەوەش لە چەندین سەرچاوەی تردا بە داڕشتنی جیاواز هاتووە: لەوانە موصەننەفی عبد الرزاق‌و سونەنی بەیهەقی‌و ترمذی و هتد: بڕوانە (تەفسیری سیوتی، کۆتایی تەفسیری سورەتی حەمد) کە هەموو ڕیوایەتەکانی هێناوە.

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، ل ٣٤٦

حَلَفَ بِغيرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ، أو أشْرَكَ)[1]، واته: هەرکەس سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە (کافر) بووە، یان (موشریك) بووە)، دوو ڕیوایەتە، ڕاوییەکە کەوتووەتە گومان لێیان، کە یان فەرمووی: (فقد کفر)، یان فەرمووی: (فقد أشرك)...ئەمە بابەتێکە کە باسکراوە، سوێندخواردن بە غەیری خوا، چونکە لەبەر ئەوەیە کەمێك ڕێزلێنانی تێدایە، هەمیشە لەناو عولەمادا جێی باس بووە. بۆ نموونە (ابن مسعود) کە یەکێکە لە (سابقین) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێ: "ئەگەر من بە درۆوە سوێند بخۆمو بڵێم: (سوێند بەخوا)، پێم ئاسانترو خۆشترە، تا بەڕاست سوێند بخۆمو بڵێم: (سوێند بە پێغەمبەر)، یان (سوێند بە فلانە کەس)، چونکە ئەگەر بە درۆوە بڵێم: (سوێند بە خوا) تووشی گوناهێك بووم، بەڵام ئەگەر بە ڕاست بڵێم (سوێند بە پێغەمبەر) یان (بە کەسێکی تر قەسەم)، ئەوە

---

[1] ئەم ڕیوایەتە، لەم سەرچاوانەدا هاتووە: الترمذي: ٤/١١٠، البیهقي لە: الکبری، ١٠/٢٩، وتووشیەتی: "حدیث صحیح علی شرط الشیخین"، أبو داود: ٢/٢٤٢، أحمد: ٢/٨٦، ابن حبان: ١٠/١٩٩، و الحاکم لە: المستدرك ١/٦٥.

تووشی جۆرێك له (شیرك) بووم‌و گوناهەکانی تر هەرچییەك بن له خوار شیرکەوەن"![1]، لەبەر ئەوە دەبێت ئینسان ئیحتیات بکات، هەرگیز بە غەیری خوا سوێند نەخوات."[2]

١٠- بەلگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی هەرکەس له دەمی دەرچوو، سوێندی خوارد بەغەیری خوا، دەبێت خێرا یەکتاپەرستیی خۆی دووپات بکاتەوەو بڵێت: لا إله إلا الله:

لەو بارەیەوە مامۆستا ناصر دەڵێت: "لەم زەمینەیەدا فەرموودەیەکی ئیمام (بوخاری) کە کتێبەکەی موعتەبەرترین کتێبە لە کتێبەکانی فەرموودەدا، ڕیوایەت دەکات کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (مَنْ حَلَفَ وقال في حلفه:

---

[1] ئەم ڕیوایەتە بەم دەقە: "لأن أحلِفَ بالله كاذبا أحبّ إليّ من أن أحلفَ بغيره صادقا"، لەم سەرچاوانەدا هاتووە: مصنّف ابن أبي شيبة: ٧٩/٣، هەروەها: الطبراني لە: المعجم الكبير ١٨٣/٩ و مصنف عبد الرزاق: ٤٦٩/٨، عەللامە (ئەلبانی)یش لە (إرواء الغليل)، بە ژمارە: ٢٥٦٢ دەڵێت: ڕیوایەتەکە صەحیحە.

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥١٢.

واللاتِ والعُزّی، فَلْيَقُلْ لا إله إلا الله)[1]. صەحابە جارجار لەبەر عادەتی پێشتریان، لەدەمیان دەردەچوو، دەیانوت: (واللات والعزّی)، واتە: سوێند بە لاتو عوززا! لەسەر زمانیان دەترازا، جا پێغەمبەری خوا فەرمووی: (هەر کەسێك لە دەمی دەرچوو وتی: (واللات والعزّی)!، با یەکسەر موسڵمانەتییو تەوحیدەکەی تازە بکاتەوەو بڵێت: (لا إله إلا الله)، چونکە ئەو سوێندخواردنە لەتمەی لێ دەدات، بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەمە بکاتەوە، دەبێت بڵێت: (لا إله إلا الله)."[2]

١١- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە نووسینی نوشتەی ناشەرعیی دابێکی نەفامییەو ڕوقیەو دۆعای شەرعیی تەنها بە قورئان دەبێت:

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: صەحیحی بوخاری، بەژمارە: ٦٦٥٠، صەحیحی موسلیم، بە ژمارە: ١٦٤٧. نەسائی، بە ژمارە: ٣٧٧٥، سونەنی ئەبو داود، بە ژمارە: ٣٢٤٧، سونەنی ابن ماجە، بە ژمارە: ٢٠٩٦، موسنەدی ئەحمەد: ٣٠٩/٢.

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥١٤.

لەو بارەیەوە کاك ناصر دەڵێت: "(بۆ نموونە) لە صەحیحی (موسلم)دا —کە کتێبی ژمارە دووە لە کتێبەکانی فەرمودەدا— ریوایەت کراوە کە (عەوف کوڕی مالك)، دەڵێت: (ئێمە لە جاهیلییەتدا ئەم کارانەمان دەکرد، وتمان: بە پێغەمبەری خوا (ﷺ): ئەمە چۆنە؟ ئایا دروستە ئێمە ئەم جۆرە شتانە ئەنجام بدەین، یان نا؟ (ئەمە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن: (رُقْيَة)، شتێك کە ئینسان بیخوێنێ بەسەر کەسێکدا، یان بەسەر شتێکدا، بۆ ئەوەی کە چاك ببێتەوە، (واتە نوشتە))، فەرمووی: (أعْرِضُوا عَلَيّ رُقَاكُم، لا بَأسَ بِالرُّقى ما لَم تَكُن شِرْكًا)[1]، واتە: (ئەو نوشتەو دۆعایانەتان بێنن، پیشانم بدەن)، بیانخوێننەوە بۆم، بزانم چۆنن‌و چین؟ (رُقْيَة)کان ئەگەر شیرك نەبن‌و هاوەڵ بۆ خوا دانانیان تێدا نەبێت، قەی ناکات.. یانی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکردن، ئەگەر بهاتایەو لەناو یەکێك لەوانەدا شتێکی تێدا بووایە ئەوەی بگەیاندایە کە چاوەڕێی سوودێك، یان لادانی

---

١ صحيح مسلم، كتاب السلام، باب: لا بأس بالرقى، ما لم يكن فيه شرك، بە ژمارە: ٢٢٠٠.

زیانێك له غەیری خوا هەیە، ئەمانەی بە (شیرك) دادەناو ڕەدی دەكردنەوە. ئەگەر شتێك غەیری ئەوەش بووایە، بۆ نموونە دلوا له خوا بكات، خوایە شیفای ئەم كەسە بدەو لەم بابەتە دوعای خێرێك بووایە، ئیجازەی دەدا."[1]

١٢- بەڵگەمێنانەوە بە فەرمووده لەسەر حەرامبوونی شەنس‌و فاڵگرتنەوە بە ئەستێرە:

لەو بارەیەشەوە لە هەمان ئاقاردا كاك ناصر دەڵێت: "(أبو داود) فەرمودەیەكی بە سەنەدێكی صەحیح ڕیوایەت كردووە- ئەویش یەكێكە لە عولەمای گەورەی فەرموده- بەم جۆرەیە: كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من اقتبس شعبة من النجوم، فقد اقتبس شعبة من السحر)[2]، واتە: هەر كەس یەك لق، یەك ڕشتە، لە (حسابگرتنەوە) - لەسەر ئەساسی چارەنووس‌و بەخت‌و ناوی ئەستێرەكان- وەربگرێت‌و قبوڵی

---

[1] ڕەشنووسی كتێبی وانەكانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥١٥.

[2] ئەم ڕیوایەتە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: سوونەنی ئەبو داوود: ٣٩٠٥، سوونەنی ابن ماجە: ٣٧٢٦، بە سەنەدی صەحیح، موسنەدی ئەحمەد: ١/٢٢٧.

بکات، ئەمە بەشێك‌و لقێك لەشیرکی وەرگرتووە. جا لەولاشەوە لە بارەی شیرکدا (ئیمام بوخاری) ڕیوایەت دەکات کە (بجالەی کوڕی عەبدە)، یەکێکە لە موسڵمانان دەڵێت: خەلیفە عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) لە دەورەی خیلافەتیدا فەرمانی بۆ دەرکردن‌و بۆی نووسین: (أُقْتُلُوا كلَّ ساحِرٍ وساحِرَة)[1]: هەرچی پیاوی ساحیرو ژنی ساحیرە بیانکوژن. دیارە کە کوشتنیش هەروا بۆ شتێکی سووك‌و ئاسان ناوترێت، ئەمە لەوانەیە کە خوا دەفەرموێ: (دروست نیە گیانێك، نەفسێك بکوژرێت، مەگەر یان بە قصاص، یان لە کاتێکدا کە (إفساد في الأرض) بکات، کە ئەم سیحرە ئەچێتە ئەو خانەیەوە."[2]

١٢- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە نابێت موسڵمان بچێتە لای (عرّاف) و(کاهن)و بڕوایان پێ بکات:

---

[1] ئەم ڕیوایەتە بوخاری، بە ژمارە: ٣١٥٦و ئەبو داوود، بە ژمارە: ٣٠٤٣، گێڕاویانەتەوە.

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥١٦.

لەو بارەیەشەوە مامۆستا ناصر دەڵێت: "(ئیمام مسلم) لە کتێبە صەحیحەکەیدا ڕیوایەت دەکات، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من أتى عرّافاً فسألهُ عن شيءٍ، فَصَدَّقَهُ، لَمْ تُقبلْ لَهُ صَلاةُ أربعينَ يَوْمًا).[1] (عرّاف) لەگەڵ کاهیندا لە یەکەوە نزیکن، (عَرّاف) بە کەسێك دەڵێن لای خەڵکی بانگەشەی ئەوە بکات کە من شتی زۆر دەزانم، بۆ نموونە لە ئایندەی ئێوە شت دەزانم، ئاواتان بەسەردێتو ئاوا ڕووداوێك دێتە ڕێتانو لە دەستی ڕزگارتان دەبێت، هاوسێیەکتان هەیە کە لە پێی تۆدایەو لەتمەیەك لێ ئەداتو بەڵام سەرکەوتوو نابێت.. لەم دەنگو باسو بابەتانە! یان گوایە خەبەر ئەدەن لەو شتانەی کە لە دڵی ئینساندان. (کاهین)یش نزیکی ئەمەیە...جا فەرموودەکە دەفەرموێ: هەر کەسێك بچێتە لای

[1] ئەو ڕیوایەتەی سەرەوە، بەو دەقە کە مامۆستا ناصر هێناویەتی لە موسنەدی ئەحمەد: ٦٨/٤ هاتووەو هەندێك لە زانایانی فەرموودە وتوویانە: وشەی (فَصَدَّقَهُ)ی تێدا نیە. ئەو دەقەی کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە، بە ژمارە:٢٢٣٠ بەم جۆرەیە: (مَنْ أتى عَرَّافًا فَسَألَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةُ أرْبَعِينَ لَيْلَةً).

عەررافێك –ئەو فاڵچیو حسابگیرانەی كە دەگەڕێنو ئەوانەی بە خەیاڵی خۆیان چارەنووسی خەڵك دیاری ئەكەن، (لەوانن)– شتێكی لێ بپرسیو دوایی باوەڕی پێ بكات، چل ڕۆژ نوێژی لێ قبوڵ ناكرێت..

جا ئەگەر ئینسان كەمێك بیر لەم فەرموودەیە بكاتەوە، دەزانێت كە ئەم مەسەلەیە چەندە گەورەیە، خوا لە قورئاندا باسی كردووە كە نوێژ چلەپۆپەی چاكەو حەسەناتەو (سەیئات) ڕادەماڵێت، وەك لە كۆتایی سورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود" [1]

١٤– بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی كە نابێت موسڵمان بڕوای بە شوومو شەنسو نوقڵانەلێدانو ئەوجۆرە شتانە هەبێت:

---

[1] ڕەشنووسی كتێبی وانەكانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥١٩.

لەم بارەیەوە مامۆستا ناصر دەڵێت: "لەم زەمینەیەشدا فەرموودەیەك هەیە بە سەنەدێکی باش، (بزّار) ڕیوایەتی کردووە، کە ئەویش یەکێکە لە عولەمای فەرموودە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ليس مِنّا مَنْ تَطَيَّرَ، أو تُطيِّرَ له، أو تَكَهنَّ، أو تُكُهِّنَ له، أو سَحَرَ أو سُحِرَ لَهُ)[1]. واتە: لە ئێمە نیە، لێمان بەدەرە، کەسێك کە شتێك بە (شووم) بزانێت، چونکە ئینسانی موسڵمان عەقیدەی ئەوەندە پاكو خاوێنە کە تەنها خوا بەوە دەزانێت کە بتوانێت نەفعێك بێنێت، یان زەرەرێك لادات، بۆ ئەمەش ئەسبابێکی دیاریکراوی داناوە. بۆ نموونە (پژمە)ی ئینسان لە قانونی خوادا هۆکاری جەلبی نەفع یان دەفعی زەرەر نیە، شتێکە وەهمی خەڵك دروستی دەکات، جا کاتێك وەهمێکیش ئاوا بوو کە ئەم پژمەیەی کرد بە بەربەستێك لە بەردەم ئەنجامدانی کارێكو کۆڕانی بڕیار بۆ

---

[1] (بزّار) لە کتێبی (الترغیب): ٢٣/٤ و (الهیثمي) لە کتێبی (مجمع الزوائد): ٥/ ١١٧، ئەو ڕیوایەتەیان گێڕاوەتەوەو (المنذري) سەبارەت بە پلەی دروستیی سەنەدی ڕیوایەتەکە وتوویەتی: (جیّد)ە.

شتێك، ئیتر پێش لە وەهمی ناگیرێت، دوایی ئیحتیمالی هەیە هەرچی شێوەی شیرکیشە لەم زەمینە نادروستەدا کە لەمەدا پەیدا بووە، جێگیر ببێت. هەروەها دەفەرموێ: لە ئێمە نیە کەسێکیش کە خەڵکی تر وای بۆ بکەن، یانی کەسێك خۆی ئەم کارە نەکات، بەڵام کەسێکی تر –بۆ نموونە بڵێت–: سەبری هێنا!، پژمەیەك لێ درا، تۆ ئەو کارە مەکەو ئەویش قبوڵی بکات لەو، ئەویش ج خۆی بیکات، شێوەی یەکەم، ج خەڵك بۆی بکەن‌و قبوڵی بکات، بە هەرحاڵ هەر قبوڵی کردووەو پەیرەوی ئەو وەهمەی کردووە.[1]

١٥– بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە نابێت زیادەڕۆیی لە تەقدیسی پێغەمبەردا بکرێت:

لەم بارەیەوە مامۆستا ناصر دەڵێت: "فەرموودەیەك هەیە (بوخاری)و (موسلیم) ڕیوایەتیان کردووە –کە ئیتر فەرموودەیەك ئەم دووانە بە یەکەوە ڕیوایەتی بکەن، زۆر موعتەبەرەو لە فەرموودە صەحیحەکانە - دەفەرموێ :

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٢٣.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە زەمینەی قەدەغەکردنی زیادەڕۆیی لەڕێزگرتنی پیاوچاکاندا، فەرمویەتی: (لا تُطْرُونِي كما أطْرَت النَّصارى ابن مريم، فإنَّما أنا عَبْدُهُ، فقولوا: عبدُ الله ورسولُه)[1]، واتە: ئەوەندە بە مندا هەڵمەدەن، ئەوەندە ستایشم مەکەن لە سنوور دەربچن، وەك ئەوەی (نەصارا) سەبارەت بە (عیسی) کوڕی (مریەم) کردیان. من عەبدێکم، بەندەیەکم، بڵێن: (عبد الله ورسوله)، یانی حەقتان نیە وەصفێکی وەهام بکەن کە ببنە هۆی باسکردنی هەندێك شت کە حەق نیە لە بارەی منەوە زیادەڕۆیی لەم زەمینەیەدا بکەن."[2]

١٦- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر قەدەغەکردنی وشەی (سیِّد) بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ):

کاك ناصر لەم لایەنەشەوە نموونە بە چەند فەرموودەیەك دێنێتەوەو دەڵێت: "لە زەمینەی قەدەغەکردنی زیادە

---

[1] ئەم فەرموودەیە بوخاری لە بەشی (أحاديث الأنبياء)، بە ژمارە (٣١٨٩) گێڕاویەتەوە.

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، ل: ٥٢٦.

ڕێزگرتنی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)و بەرزکردنەوەی زیاتر لەو مەنزیلەتەی کە خوا پێی داوە -کە عبودییەت و ڕیسالەتە- (أبوداود) بە سەندێکی باش (جیّد) فەرموودەیەك ڕیوایەت دەکات، دەڵێت: یەکێك لە موسڵمانان بە ناوی (عبد الله) دەڵێت: (انطلقت في وفد بني عامر إلى رسول الله (ﷺ): لەگەڵ نوێنەرانی تایفەی (بەنی عامر)دا چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا، (فقلنا: أنتَ سيّدُنا): وتمان -بە پێغەمبەری خوا- تۆ سەییدو سەروەری ئێمەیت، (قال: السيّد الله تبارك وتعالى)[1]، پێغەمبەری خوا فەرمووی: سەروەرو سەید (الله) خوای گەورەیە، نەك من. کەواتە قەدەغەی کرد کە وشەی (سەید)ی بۆ بەکار ببەن.

هەروەها (نەسائی) کە یەکێکی ترە لە ئەئیمەی فەرموودە، ئەویش هەر بە سەنەدێکی باش، لەم زەمینەیەدا ڕیوایەت دەکات کە (أنس بن مالك)- یەکێکە لە صەحابە (خوای لێی ڕازی بێت)- دەفەرموێ: کۆمەڵێك هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا

---

[1] لە (سنن أبي داود، كتاب الأدب، باب في كراهية التمادح)، بە ژمارە: ٤٨٠٦، هاتووە.

(ﷺ)، وتيان: (يا رسول الله، يا خَيْرَنا، وابن خَيْرِنا، وسَيِّدَنا، وابن سَيِّدِنا): (ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی باشترینی ئێمە، ئەی کوڕی باشترینی ئێمە، ئەی سەروەری ئێمە، ئەی کوڕی سەروەری ئێمە!)، ئاوا ناویان دەبردو بانگیان لێدەکرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (يا أيها الناس، قولوا بقولكم، ولا يَستَهوِيَنَّكُم الشيطان، أنا محمد بن عبد الله ورسوله، واللهِ ما أُحِبّ أن تَرفَعُوني فوق منزلتي التي أنزلني الله عزَّ وجلَّ)[1]، فەرمووی: خەڵکینە، قسەیەك کە شایستەیە بیکەن، ئەمە ئێوە چی دەڵێن؟ شەیتان سقوتتان پێ نەکاتو نەتانکێشێ بەرەو لای خۆی، من، موحەممەد، بەندەو ڕەسولی خوام، من حەز ناکەمو پێم ناخۆشە کە باڵاتر لە پلەوپایەیەك کە خوا بۆی داناوم، بمبەنو بەرزم بکەنەوە، پلەی من عبودیەتو ڕیسالەتە.

---

[1] نەسائی بە سەنەدی (جێد)، ڕیوایەتی کردووە. پێشەوا ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیدا: ١٥٣/٣، ڕیوایەتی کردووە.

یانی: (سیّدنا، ابن سیّدنا، خیرنا، ابن خیرنا)و.. ئەمانە چین، بۆ من بەکاری دێنن.؟!"[1]

١٧- بەڵگەهێنانەوە بەفەرموودە لەسەر حەرامبوونی (بیدعە)و داهێنان لە عیبادەتدا:

لەو بارەیەشەوە مامۆستا ناصر فەرموودەیەکی بە ناوبانگ دەکاتە بەڵگەو دەڵێت: "فەرموودەی ترمان هەیە بۆ ئەمە، دەفەرموێ: (كلُّ ما ليس عليه أمرُنا فهو رَدّ)[2]: هەرچییەك فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێتو بە پێی فەرمانی ئێمە نەبێت وەرنەگیراوە، یانی ئەگەرچی بە مەبەستی عیبادەتو بەندەیی خواش بێت."[3]

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خولناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٢٧.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: صەحیحی بوخاری، بە ژمارە: ٢٦٩٧، صەحیحی موسلیم، بە ژمارە: ١٧١٨، سونەنی ئەبوداوود، بە ژمارە: ٤٦٠٦، (ابن ماجه) بە ژمارە: ١٤، سونەنی دارەقوتنی، بە ژمارە:٤/٢٢٤ ، سونەنی بەیهەقی، بە ژمارە: ١٠/١١٩.

[3] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خولناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٢٨.

١٨- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە لە صەڵاواتدانی ناو (تەحیات)ی نوێژدا وشەی (سیّدنا) بەکار نەبراوە:

مامۆستا ناصر دەڵێت: "لەم زەمینەیەدا تەنانەت هەڵە تا ئەو سنورە گەشتووە، دەخالەت کراوە لە گۆشەیەك لە مەسائیلی عیبادەتدا، کە حەق نیە هیچ جۆرە دەخالەتێکی تێدا بکرێت، صەڵاواتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی صیغەو عیبارەتەکەی داناوە، دەبێت بە پێی ئەوە صەڵاوات بدرێت، هەستاون زیادەیان تێداکردووە، (مەبەستی زیادکردنی وشەی (سیّدنا)یە). صەحابە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یان پرسی: خوا فەرمویەتی (صلّوا علیه)، ئێمە چۆن صەڵاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: ئاوا بڵێن: (اللهم صلِّ علی محمد وعلی آل محمد، کما صلّیت علی آل إبراهیم، وبارِكْ علی محمد، وعلی آل محمد، کما بارکت علی آل إبراهیم في العالمین، إنّك حَمیدٌ مَجید).ئەمە ڕیوایەتێکە، هەندێ ڕیوایەتی تریش هەن، بەم جۆرە: (علی إبراهیم وعلی آل إبراهیم)، هەروەها ڕیوایەت

مەیە (أزواجە وذریاتە)یش زیادکراوە بە (آل)ەکە، کە ئەوان بە شێوەی تایبەتی ناویان براوە لە جوملەی (آل)، کە لە هیچ کام لەم ڕیوایەتانە وشەی (سیّد) نیە، کەچی هاتوون وشەی (سیّد)یان بەکار بردووە.[1]

١٩- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە ڕەوا نییە قەبرستان و سەر قەبری صاڵحان بکرێتە مزگەوت، یان نوێژیان تیادا بکرێت:

لەم بارەیەوە مامۆستا ناصر چەند فەرموودەکی هێناوەو دەڵێت: "لە بارەی ڕێزگرتن لە قەبری پێغەمبەران (عیلهم الصلاة والسلام)و کردنیان بەجێی نوێژ بۆ موبارەکیی، ئیمام موسلیم لە کتێبە صەحیحەکەیدا فەرمودەیەک ڕیوایەت دەکات، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی فەوت بکات، فەرمووی: (ألا إنما کان قبلکم کانوا یتخذون قبور أنبیائهم وصالحیهم مساجد، ألا فلا تتّخذوا القبور مساجد، إني

[1] ڕەخنەنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٢٨.

أنهاكم عن ذلك)[1]، فەرمووی: ها، وریا بن! ئەوانەی پێش ئێوە، گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان دەکرد بە جێگەی نوێژیان، بۆ بەرەکەت دەچوون لەوێ نوێژیان دەکرد، تا (گوایە) نوێژەکەیان باشتر قبوڵ بێت! هۆشتان بێت ها! قەبرەکان نەکەن بە جێگەی نوێژ، ئەوە من نەهیتان لێ دەکەم. پێی ڕاگەیاندن ئەو غەڵەتەی کە پێشینان تووشی بوون، ئێوە تووشی نەبن، چونکە نوێژ دەبێت موخلیصانەترین کار بێت، کە ئینسان بۆ خوا ئەنجامی دەدات، لەوێ شتی تری تێکەڵاو دەبێت، دەچێت لەسەر ئەو قەبرە نوێژەکە دەکات، (گوایە) بۆ ئەوەی باشتر قبوڵ ببێت، بۆ نموونە بەرەکەتێك بۆ ئەو کەسە لەوێ نازڵ دەبێت، ئەمیش بگرێتەوەو نوێژەکەی باشتر ئەنجام بدات.

هەروەها دایکی ئیمانداران (عائیشە)و (ابن عباس) (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموون: (لَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ

---

[1] سەرچاوەی فەرموودەکە:" (صحیح مسلم، کتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب النهي عن بناء المساجد على القبور، واتخاذ الصور فيها، والنهي عن اتخاذ القبور مساجد)، بە ژمارە: ٥٣٢.

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ بِهَا كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ فَقَالَ -وَهُوَ كَذَلِكَ- لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ، يُحَذِّرُ مَا صَنَعُوا)[1].

فەرمودەکە لە نێوان (بوخاری‌و مسلم)دا (متفق علیه)یە، کە پلەی زۆر بەرزە، دەفەرموون: کاتێك کە پێغەمبەری خوا کەوتە حاڵەتی مەرگ، لەو کاتەدا پارچە پەڕۆیەك لای دەستیدا بوو، هەروا ناویەناو دەیدا بەسەر دەم‌وچاویدا، دوای ماوەیەك لەسەر دەم‌و چاوی لایداو فەرمووی: لەعنەتی خوا لە یەهودو نەصارا، قەبری پێغەمبەرەکانیان کرد بە جێگەی نوێژ. (عائیشە)و (ابن عباس) (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموون: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەترسا، وریای دەکردنەوە لەوەی کە لەوەو پێش کرلوە، لە ئوممەتی ئەمیشدا دووبارە نەبێتەوە)[2].

---

[1] ئەم فەرمودەیە لەم سەرچاوەیەدا هاتووە: (صحیح البخاري، کتاب الصلاة، أبواب استقبال القبلة، باب الصلاة في البیعة)، بە ژمارە: ٤٢٥. هەروەها: (صحیح مسلم، کتاب المساجد، ١/٣٧٧).

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٣٢.

٢٠- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە ناڕەوایە مرۆڤ لەسەر گۆڕی مردووان دابنیشێت، یان نوێژیان لە گۆڕستان بکات:

لەم بارەیەشەوە مامۆستا ناصر دەڵێت: "... تەنانەت بە شێوەی ڕەها نەهی کراوە لەوەی کە ئینسان بەرەو ڕووی هەر قەبرێك نوێژ بکات. فەرموودەیەکی تری صەحیح کە ئیمام موسلیم ڕیوایەتی دەکات، دەفەرموێت: (لا تَجْلِسُوا على القبورِ، ولا تُصَلّوُا إليها)، دامەنیشن لەسەر گۆڕەکان -ئیتر دانیشتن بە هەر شێوەیەك بێت، بۆ نموونە بچێت دانیشێت بۆ کەسبی فەیزو بەرەکەت، یان بە شێوەی ئیهانەت و بێڕێزیی لەسەری دانیشێت، جگە لە حاڵاتی زەروری، کە ئینسان هیچ ڕێگەیەکی نامێنێت- هەروەها ڕوو بە گۆڕەکان، نوێژ مەکەن..

ئیتر ئەوە تەولو براوەتەوە، بۆ ئەوەی هیچ بیانوویەك نەمێنێتەوە، چونکە ئەگەر ڕێگەبدرێت بەرەو ڕووی قەبرێك نوێژ بکرێت -ئەگەر چی بە شێوەی ئاساییش بێت- دوایی ڕێگە دەکرێتەوە، کەسێك دەچێت بۆ قەبرێکی ترو یەکێك بۆ

یەکێکی ترو پاشان دەچنە سەر قەبری صالّحەکان‌و ڕوویان تێدەکەن‌و ئەو مەسەلەی شیرکە پەرە دەسێنێت."[1]

٢١- بەلگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە ناڕەوایە بینا لەسەر گۆڕی مردووان دروست بکرێت‌و گەچکاریی گۆڕ بکرێت:

لەو بارەیەوە کاك ناصر فەرموودەیەك دەکاتە بەلگەو دەڵێت: "ئیمام موسلیم ڕیوایەت دەکات، (جابر) -کە یەکێکە لە صەحابە- دەفەرموێ: (نهی رسول الله (ﷺ) عن تجصیص القبر، وأن یقعد علیه، وأن یبنی علیه بناء)،[2] واتە: پێغەمبەری خوا نەهی کرد لەوەی قەبر گەچکاریی‌و ئاهەککاری بکرێت، یانی دەبێت حاڵەتێکی عادی ببێت، تەنها خۆڵ‌و بەرد بێت، تا کاتێك ئەو ئێسقانانە پتورکان‌و بوون بە خاك، ئیتر ڕێگە بدات بۆ ئەوەی هەڵتەکێنرێن‌و دووبارە کەسێکی تری تێبخەن، خۆ ئەو قەبرە تا قیامەت موڵکی ئەو نیە، تا کاتێك بەشێك لەوی

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٣٢.

[2] سەرچاوەی ئەم فەرموودەیە: (صحیح مسلم، کتاب الجنائز، باب النهي عن تجصیص القبر والبناء علیه)، بە ژمارە: ٩٧٠.

تێدا ماوە، قەبری ئەوە، دوایی دووبارە سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ قەبری تر، بۆیە نەهی کرد لەوەی کە ئاهەککاریی‌و گەچکاریی بکرێت.[1]

٢٢- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە ڕەوا نییە گۆڕی مردوو بەرز بکرێتەوە:

کاک ناصر دەڵێت: "لە فەرمودەیەکدا کە (ئیمام موسلیم) ریوایەتی دەکات لە خەلیفە عەلی (خوای لێ ڕازی بێت)، دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی بۆ شوێنێك، بۆ مەئموریەتێك، کە ئەوە بوو بکەم بە هەر قەبرێکی بەرز، لەگەڵ زەویدا ڕێکی بکەمەوەو تەختی بکەم، وازی لێ نەهێنرێ هەروا بە بەرزی بهێڵریتەوە، (ﷺ) (بعثه، وأمره ألّا يَدَعَ قبرا مُشْرِفًا، إِلّا سَوّاهُ)[2].

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٣٨.

[2] ئەم فەرموودەیە موسلیم بە ژمارە (٩٦٩)، گێڕاویەتەوە. بەڵام زانایان وتوویانە: مەبەست ئەوە نیە کە گۆڕی مردوو بە تەواویی تەخت بکرێت لەگەڵ زەوی، بەڵکو دەتوانرێت بە ئەندازەی بستێك بەرز بکرێتەوە، ئەوەندەی کە بزانرێت ئەو شوێنە گۆڕەو لاشەی تێدایە. فەرموودەکە

٢٣ـ بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوەی کە هەڵواسینی پەڕۆو پاتاڵ‌و هەرشتی تر بە دارو درەختدا، بە نیەتی پاڕانەوە لە غەیری خوا، قەدەغە کراوە:

کاک ناصر دەڵێت: "یەکێکی تر لەو لادانە عەقیدەییانەی کە لەناو موسڵماناندا پەرەی سەندووە، ئەوەیە هەندێك شت کە پەیوەندیی بەیەکێك لە پیاو صاڵحانەوە بێت، دەیکەن بە جێی تەوەججوهی قەلبیان‌و بە موبارەکی دەزانن‌و لێی چاوەڕێ دەکەن کە ببێت بە واسیتە بۆ ڕاکێشانی سوودو لادانی زیان. لەم نموونەیە لە زەمانی پێغەمبەردا (ﷺ) شتێك ڕووی دا، (ترمذی) فەرموودەیەك دەگێڕێتەوەو پلەکەی بە (صەحیح) دادەنێت، دەفەرموێ: (أبو واقد الليثي)، یەکێکە لە موسڵمانانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (خَرَجُوا عَنْ مَكَّةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى حُنَيْنٍ، قَالَ: وَكَانَ لِلْكُفَّارِ سِدْرَةٌ يَعْكُفُونَ

---

مەبەستی ئەو گۆڕانە بووە کە لەو سەردەمەدا زۆر بەرز کراونەتەوەو هەندێکیان بێشکەو بینایان لەسەر دروستکراوە. بڕوانە: (شرح النووي على صحيح مسلم)، (٧/٣٦).

عِنْدَهَا، وَيُعَلِّقُونَ بِهَا أَسْلِحَتَهُمْ؛ يُقَالُ لَهَا: ذَاتُ أَنْوَاطٍ. قَالَ: فَمَرَرْنَا بِسِدْرَةٍ خَضْرَاءَ عَظِيمَةٍ، قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اجْعَلْ لَنَا ذَاتَ أَنْوَاطٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : قُلْتُمْ —وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ— كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى: اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ! قَالَ: إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ. إِنَّهَا لَسُنَنٌ، لَتَرْكَبُنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، سُنَّةً سُنَّةً). (ابن أبي عاصم) له (كتاب السنة)دا ئەم ڕستەیەی زیاد کردووە: (.. ونحن حديثو عهد بكفر).[1]

دەڵێت: کاتێك کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا چوون بۆ (حونەین)، لەوێ موشریکەکان درەختێکیان هەبوو، بە ناوی (سیدرە) —کە بە فارسی (کنار)ی پێ دەڵێن— بە شتیان دەزانی، لە لایدا زۆر دەمانەوەو بە بەرەکەتداریان دەزانی‌و ئەسلەحەکانیان پێدا هەڵدەواسی، ئیتر ئەوەندە مەشهور بوو بوو کە پێیان دەوت (ذات أنواط)، یانی ئەو درەختەی کە شتی

---

[1] سەرچاوەکانی ئەم فەرموودەیە: موسنەدی ئەحمەد: بەژمارە:٢١٣٩٠، سوونەنی ترمذي، بە ژمارە: ٢١٨٠، بە سەنەدی (حسن صحيح)، (ئەلبانی)ش لە (رياض الجنة)دا بە ژمارە: ٧٦، وتوویەتی: (صحيح)ە.

پێدا ئاوێزان دەکرێت. دەڵێت: ئێمەش تێپەڕین بە لای درەختێکی سەوزی بەرز لەوانە، وتمان بە پێغەمبەری خوا: ئا، (ذات أنواط)ێکیش بۆ ئێمە دابنێ. یانی با ئێمەش درەختێکی ئاوامان ببێت، جێی تەوەجوهی دڵمان بێتو موبارەك بێتو ئەسلەحەو شتی خۆمانی پێدا بکەینو بچین لە بنیدا دانیشین! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، هەر ئەو قسەیەی قەومی (موسا) کردیان، لەگەڵ مندا کردتان.(مەبەست ئەوەیە کاتێك لە دەست فیرعەون نەجاتیان بوو، لە ئاوەکە کردیانە ئەویەرموەو بەرەو (سینا) دەچوون، دایان بەلای قەومێکی موشریکدا، کە فەریادڕەسیان بۆ خۆیان دانابوو. ئەمانیش لە دوای ئەو هەموو زەحمەتە کە موسا پێغەمبەر لەگەڵیان کێشابووی، –هەوڵی دابوو کە دەروونیان تەصفیە بکات لەوەی کە جگە لەخوا هیچ لایەنێك بە ئیلاهو فەریادڕەس‌و فەرمانڕەوای خۆیان نەزانن– داوایان لێ کرد، وتیان: ئادەی، وەك چۆن ئەم قەومە ئالیهەو فەریادڕەسانیان هەیە، بۆ ئێمەش چەند فەریادڕەسێك

دامەزرێنە، (تا بیانکەین بە وەسیلەو واسیتە لە نێوان خۆمانو خوادا)! وەڵامی پێغەمبەر موسا ئەوەبوو کە ﴿إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾﴾ الأعراف، ئێوە قەومێکی جاهیلو نەزانن، (کە وەها پێشنیارێك دەکەن، ئینسانێك خوا بۆ ئەوەی دروست کردووەو توانایی‌و ئیستیعدادی ئاوای پێداوە، کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ خۆیدا پەیوەندیی بکاتو داوای سوودو لادانی زیانی لێبکات، ئیتر واسیتەو وەسیلەدانان لە نێوان خۆی‌و خوادا، یانی چی!) ئەنجا فەرمووی: ئەوە ڕەوش‌و ڕێبازگەلێکن، ئێوەش سواری ئەو ڕەوش‌و ڕێبازانە ئەبن‌و سوننەت بەسوننەت دەچن بە شوێنیاندا..) لە بەرامبەری ئەم پێشنیارەوە، وەها وەڵامی دانەوە، تەنانەت لێرەدا ئەو ڕستەیەی کە لە قورئاندا بۆ قەومی پێغەمبەر موسا (علیه الصلاة والسلام) دەیگێڕێتەوە، ئەوەی بەبیرهێنانەوە کە وتیان: ﴿اجْعَل لَّنَا إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ ﴿١٣٨﴾﴾ الأعراف، یانی: دڵولکردنی دانانی ئاوا درەختێك وەکو شتێکی موبارەك، دڵولکردنی دانانی ئیلاهێکە، فەریادڕەسێکە، کە دەکرێت بە

شەریکی خوا، سەرەنجام دلواکردنی دامەرزاندنی (شیرك)ێکە کە پێغەمبەران (علیهم السلام) بۆ ململانێو بەرەنگاربوونەوەی ئەو شتە نێرراون."[1]

٢٤- بەڵگەهێنانەوە بە فەرمووده لەسەر ئەوەی حەرامە کە مرۆڤ بڵێت: (ما شاء الله وما شاء فلان):

مامۆستا ناصر دەڵێت: "لە فەرمودەیەکدا کە (أبو دواد) - یەکێکە لە ئەئیمەی فەرمودە- بە سەنەدێکی صەحیح ڕیوایەتی دەکات، کە یەکێك لە صەحابە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لا تقولوا ما شاء الله وشاء فلان، ولكن قولوا ما شاء الله، ثم شاء فلان)[2]، فەرمووی: مەڵێن ئەگەر خواو فلان کەس بیانەوێت، بڵێن ئەگەر خوا بیەوێت ئەو

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٤١.

[2] سونەنی (أبو داود)، بە ژمارە: (٤٩٨٠)، (ئەلبانی)ش بە (صەحیح)ی داناوە.

کاره بکرێت، پاشان فلان کەسیش بیەوێت، واتە: جیایان بکەنەوە لە یەکتر."[1]

٢٥- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوە کە حەرامە کەسێك ناوبنرێت (مالك) یان (ملك الملوك) شاهەنشا:

لەو لایەنەشەوە کاك ناصر دەڵێت:" لە بەکاربردنی ئەلفازدا لە لایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئیحتیاتی وا باسکراوە، لە ناونانی کەسەکانیشدا ڕەچاو بکرێت، ناوێکی وا کە دەخاتە زەینی ئینسانەوە، کەسێك لە کەمترین شێوەی فەرمانڕەوایی یان فەرمانڕەوایی بەشدار بێت، لە بەکاربردنی ئەو ناوەو ناونانی کەسێك بەو جۆرە ئەلفازە پارێزگاریی بکرێت. بۆ نموونە لە فەرمودەیەکی صەحیحدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إن أخنى الأسماء عند الله رجل سُمِّيَ ملك الأملاك، لا مالك إلا الله)[2]، واتە: پەستترینو زەلیلترین ناو، ئەوەیە

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٤٢.

[2] دەقی فەرموودەکە لە صەحیحی بوخاری، بەم جۆرەیە: (أخنى الأسماء يوم القيامة عند الله رجل تسمّى ملك الأملاك)، صحيح البخاري،

ئینسانێك ناوبنرێت (ملك الأملاك)، جگە لە خوا هیچ مالكو خاوەنێك نیە. یان كەسێك ناوبنرێت (ملك الملوك)، پادشای پادشایان، یان بەو جۆرە كە (سوفیان كوڕی عویەینە) -یەكێك بوو لە سەلەفی صالح (خوایان لێ ڕازی بێت)- دەفەرمووێ: "وەك وشەی (شاهەنشا) كە عەجەمان بەكاری دەهێننو مانای (ملك الملوك)ە، چونكە لەم ناوەدا بانگەشەی ئەوە كراوە بۆ ئەو كەسەی كە ئەمە ناویەتی، كە فەرمانڕەوای كۆمەڵێك فەرمانڕەوایە، شایە بۆ كۆمەڵێك شا، یانی شاهی شاهان، ئەوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەی بە پەسترینو زەلیلترین (ناو) داناوە. هەروەها لە فەرموودەكەدا دەفەرمووێ:

---

كتاب الأدب، باب أبغض الأسماء إلى الله، ژمارە: ٥٨٥٢. بەڵام لە صەحیحی موسلیم بەم جۆرەیە: (إن أخنع إسم عند الله رجل تسمّى ملك الأملاك)، زاد ابن أبي شيبة في روايته: (لا مالك إلا الله تعالى). صحيح مسلم، كتاب الآداب، باب تحريم التسمّي بملك الأملاك وبملك الملوك، بە ژمارە: ٢١٤٣.

غەیری خوا کەسێك (مالك)و دەسەڵاتدار نیە، حەق نیە بە هیچ کەس بوترێت (مالك الملك)."[1]

٢٦- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوە کە حەرامە مرۆڤ جوێن بە زەمانەو ڕۆژگار (دەهر) بدات:

هەروەها کاك ناصر دەڵێت: "لە زەمینەی ئیحتیاتکردن لە ئەلفازدا، بۆ ئەوەی ئینسان بە کەمترین شێوەش تووشی شیرك نەیەت، فەرمودەیەکی تری صەحیح هەیە کە دەفەرموێت: (قال الله تعالى: يؤذيني ابن آدم، يَسُبُّ الدهر، وأنا الدهر، أُقَلِّبُ ليلَه ونَهارَه).[2] پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: خوا فەرموویەتی: ئینسان ئەزیەتی من دەکات، کاتێك جنێو بە ڕۆژگار دەدات. کاتێك بۆ -نموونە- سوودێکی لەدەست دەردەچێت، یان تووشی زیانێك دێت، ڕووداوێکی ناخۆشی

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی ولنەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٤٤.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: صەحیحی موسلیم، بەژمارە: ٢٢٤٦. نزیك لەمە لە (بوخاری)ش بەژمارە: ٥٨٢٨ هاتووە. هەروەها موسنەدی ئەحمەد، بە ژمارە: ٩١٢٦، سونەنی کوبرای بەیهەقیش، بە ژمارە: ١١٤٨٧.

بەسەردا دێت، جنێو بە ڕۆژگار دەدات، لە حاڵێکدا ئەوەی ئەو بە کاری ڕۆژگاری دەزانێت -بۆیە نارازییەو جنێوی پێ دەدات- ئەوە کاری منە، منم لە جێی ڕۆژگاردا ئەو کارە دەکەم، منم کە شەوو ڕۆژ بەسەریەکدا دێنمو دەورانی جۆرجۆر دێنم. بەڵام جنێودان بە ڕۆژگار خۆی ئیعتیراف بەوەی تێدایە کە جگە لە خوا شتێکی تر وەك زەمانە؛ دەستی لە سوودو زیاندا هەیە، لەبەر ئەوەیە ئەم ئینسانە ئەو جنێوە دەدات. دەی ئەمە جۆرێکە لە شیرك، ئەوەیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: خوا فەرموویەتی: ئینسان بەم شێوەیە ئەزیەتی من دەدات."[1]

٢٧- بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودە لەسەر ئەوە کە هەماهەنگیی لە نێوان موسڵماناندا و پشتگیریی یەکترو ڕاسپاردەدان بە یەکتر، ئەرکێکی ئاینییە:

---

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٥٤٦.

لەمەشدا کاك ناصر بە فەرموودەی (المؤمنُ للمؤمنِ کالبُنیانِ، یَشدُّ بَعضُهُ بَعضا)[1]، تەفسیری ئایەتی (وتواصَوْا بالحق وتواصَوْا بالصَّبر) دەکاتو دەڵێت: "موسڵمانان تەواوکاری یەکترنو وەك بینایەکن، لەبەر ئەوەی خشتەکانی، یان بەردەکانی، پاڵ دەدەن بە یەکەوەو یەکتر مەحکەم دەکەن، لە مەجموعەی ئەوانەو بە پشتگیرییان بۆ یەکتر؛ بینایەك، ساختمانێك دروست دەبێت، کۆمەڵی ئیماندارانیش بۆ یەکتر بەو جۆرەن."[2]

٢٨ـ بەڵگەهێنانەوە بە فەرمودە لەسەر شێوازی دروستی دوعاکردن:

مامۆستا ناصر لەو بارەیەوە نموونە بە دۆعاکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەنگی بەدردا دێنێتەوەو دەڵێت: "..تەماشا

---

[1] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتووە: صەحیحی بوخاری، لە (کتاب المظالم والغصب، باب نصر المظلوم)، بە ژمارە: (٢٤٤٦). صەحیحی موسلیم، لە (کتاب البرّ والصّلة والآداب، باب تراحم المؤمنین وتعاطفهم وتعاضدهم)، بە ژمارە: (٢٥٨٥).

[2] رەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٦١٤.

دەکەی خەتیبێك لە ڕۆژی جومعەدا بە گەرمو گوڕیو بە کوڵ هاوار دەکات کە: خوایە! (ئاڵا)و پەرچەمی حکومەتی ئیسلامیی بەسەر زەویدا بشەکێنەوەو هەرچی تاغوتە لە ناوی ببەو چی بکەو چی بکەو ئەمانە..! (دەی پرسیار لێرەدا ئەمەیە): ئایا موسڵمانان خۆیان چ زەمینەسازییەکیان کردووە بۆ ئەم کارە، تا دوعای بۆ بکەن؟ دەبێت دوعای لەناوبردنی تاغوت وەك ئەوە بکرێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جەنگی (بەدر)دا کردی. ئەو موسڵمانانە بەو هەموو ئیمانەوە لەگەڵ مەلائیکەدا کە هاتوونەتە خوارەوە، خوا دەستور دەدات کە بدەن لە گەردنو سەرپەنجەی دوژمنان، یانی سوپای موئمینینی ڕاستی لە سابیقینی ئەووەلین، لەگەڵ سوپای مەلائیکەدا، بە یەکەوە خەریکن شمشێر دەوەشێننو دەدەن لە دوژمن، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: خوایە بگەرە فریای موسڵمانان، ئەگەر بێتو ئەم سوپایە ئەمڕۆ بشکێتو

نەتوانێت ئەم کافرانە تێکبشکێنێت، ئیتر لەسەر زەویدا عیبادەت بۆ تۆ ناکرێت.[1] لە کاتێکدا کە تەواوی ئەسباب‌و موقەددیمات چنراوە بۆ کارەکەو دەست بەکار بوون، لەو کاتەدایە کە هاوار دەکات‌و دوعا دەکات، چونکە لەو کاتەدایە کە دوعا قبوڵە.."[2]

٢٩- هەروەها بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەو پێنج شتەی ناونراون (مفاتح الغيب):

کاک ناصر سوبحانی دەڵێت: "فەرمودەیەک ڕیوایەت کراوە، بەم عیبارەتە دەست پێدەکات، (مفاتح الغيب خمس..)[3]:

---

[1] ئەمە دەقی عەرەبیی ئەو دوعایەی پێغەمبەری خوایە، ڕووی کردە قبیلەو فەرمووی: (اللهمَّ! أنجِزْ لي ما وعدتَني. اللهمَّ ! آتِ ما وعدتَني. اللهمَّ! إن تهلِك هذه العصابة من أهلِ الإسلامِ، لا تُعبدُ في الأرض). صەحیحی موسلیم، بە ژمارە: ١٧٦٣. صەحیحی ترمذی، بە ژمارە: ٣٠٨١.

[2] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٤٠٥.

[3] دەقی فەرموودەکە بەم جۆرەیە: (مفاتيح الغيب خمس لا يعلمها إلا الله: لا يعلم ما في غد إلا الله، ولا يعلم ما تغيض الأرحام إلا الله، ولا يعلم

کلیلەکانی غەیب (پێنج) شتن، جا یەکە یەکە پێنج شتەکە باسدەکات کە لە کۆتایی سورەتی (لقمان)دا باسکراون، کە وتمان (سیانیان) بە شێوەی سێ عیلمی غەیب لە ئایەتەکەدا بۆ خوا مەترەح کراون."[1]

---

متی یأتي المطر أحد إلا الله، ولا تدري نفس بأي أرض تموت، ولا یعلم متی تقوم الساعة إلا الله.) بوخاری بە ژمارە ٦٩٤٤.

[1] ڕەشنووسی کتێبی وانەکانی خواناسیی، ناصر سوبحانی، لا: ٣٤٤.

## دوا قسەو تکایەکی زانستییانەو برایانە

ئەم ٢٩ نمونەیەی دوایی -وەك لە سەرەتاوە وتمان- تەنها لە خوێندنەوەیەکی خێراوە بۆ کتێبی (وانەکانی خواناسیی) مامۆستا ناصر دەرمهێناون، هیوادارم لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەو کتێبە (٨٠٠) لاپەڕەییە -کە بە درێژیی ئەو خاڵ‌و تەوەرانەی تێدا شیکراونەتەوە- چاپ ببێت‌و دیدی خوێنەرانی تامەزرۆی زانست ڕوون بکاتەوە.

دیارە لە زۆربەی وانە دەنگییەکان‌و بەرهەمە نووسراوەکانی تری مامۆستا ناصردا، سەدان نموونەی تر هەن، کە تیایاندا فەرموودە دەکاتە سەرچاوەو بەڵگەیان پێ دێنێتەوە، بە تایبەتی بەرهەمەکانی: (بەندایەتی، سیستمی سیاسی ئیسلام، سیستمی ئابووریی، وانەکانی بانگەواز، حەج‌و عومرە، وانەکانی عەقیدە، تەفسیری سورەتی نوور، شەرحی کتێبی (شذور الذهب)، حوکم‌و حیکمەتەکانی ڕۆژوو، خەلقی ئادەم)و..هتد، بەڵام ئەم مشتە نموونەی خەرمانی زانستی مامۆستایەو خوێنەران خۆیان دەتوانن لەو سەرچاوە

ناوبرلوانەدا کە لەلایەن (دەزگای بەرهەم)ەوە چاپ کراون، نمونەی زیاتر ببینن.

وا بزانم ئەم ئەندازەیە لە نموونەو بەڵگە کە لەم نامیلکەیەدا باس کران، بەس بن بۆ ئەو دڵسۆزانەی کە حەزیان دەکردو حەز دەکەن لە هەڵوێستو تێڕوانینی مامۆستا ناصر سوبحانی دەربارەی سوننەتو حوجییەتی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و ڕەدکردنەوەی بیرۆکەی (ئیکتیفا بە قورئان)، ئاگادار ببنەوە.

بۆ ئەوانەش لە ڕووی نەزانینەوە، یان بە ئاگایانە، لەگەڵ باسی بیرۆکەی (ئیکتیفا بە قورئان)دا ناوی مامۆستا ناصر ئەبەن، پاش ئەم نموونانەو ئەو بڕە بەڵگانەی لەم نامیلکەیەدا باسکران، دەبێ چی تر ئەو هەڵەیە دووبارە نەکەنەوەو بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونو حەزو خۆزگەکانی خۆیان، نازانستییانە قسەی پچڕێنراوو نموونەی بۆچوونی قرتێنراوی مامۆستا ناصر نەهێننەوە، لە کاتێکدا بزانن یان نەزانن، ئەو زانا هەڵکەوتووەی کوردستان بە سەدان کاتژمێر وانەو وتارو بە سەدان لاپەڕە بابەتی نووسراوی هەنو لە دەیان شوێندا باس

له حوجییەتی سوننەت دەكاتو بە خودی قورئانی پیرۆز سەلماندوویەتی كە (سوننەت)و (حیكمەت) بە یەك واتانو دەبنە سەرچاوەی دووەمی تەشریع.

## پێگەی زانستیی مامۆستا ناصر

"مامۆستا ناصر زانایەکی کلاسیکی نەبوو، بە واتاو دەستەواژە ئیسلامییەکە (موقەللید) نەبوو، بگرە بە پێی پێناس‌و مەرجەکانی (زانستی ئوصول)، کەسێکی موجتەهید بوو، نەک بە تەنها موجتەهیدی ناو مەزهەبێک، بەڵکو موجتەهیدی دەرەوەی مەزهەبەکان بوو. واتە لەسەر بۆچوونە فیقهییەکانی هەموو مەزهەبەکان، ئیزافەو قسەو بۆچوونی نوێی هەبوو. هەروەها لەسەر بنەماو ڕێسا گشتییەکانی زانستە بنەڕەتییەکانی (أصول الفقه)و (علوم القرآن)و (علوم الحدیث)، پێشنیارو سەرنج‌و ڕێسای نوێی هەبوو.

بەو پێیە مامۆستا ناصر، بە زانایەکی ڕیفۆرمخوازو یەکێک لە پێشەنگانی ڕەوتی (ئیصلاحی فکری ئیسلامیی) دەژمێردرێت، سەرەڕای ڕێزی زۆری لە کلتورو (تراث)ی ئیسلامیی، بەڵام دژی چەقبەستوویی‌و دەمارگیریی مەزهەبیی بوو. لەگەڵ پێداچوونەوەی بنەما فیقهییەکان‌و داڕشتنەوەی هەندێک لە ڕێسا شەرعییەکان بوو. دژی داخستنی دەرگای ئیجتیهاد بوو. لەگەڵ ئەوەی بەڕێزەوە دەیڕوانییە زانایانی پێشین‌و هەوڵ‌و زەحمەتیانی دەنرخاند، بەڵام سەرنج‌و ڕەخنەو زیادوکەمکردنیشی لەسەر زۆر شتیان هەبوو.."

(بەشێک لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە)

**چەند ئایەتێك كە پێگەو ئەركی پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری دەكەن و مامۆستا ناصر سوبحانی لە باسەكانیدا كردوونیەتە بەڵگە لەسەر حوجیبەتی سوونەت، وەك سەرچاوەی دووەم:**

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ النحل/٤٤

﴿وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ النحل/ ٦٤

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ الأحزاب/ ٣٦

﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ آل عمران/ ٥٣

﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ النساء/٤١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا﴾ النساء/ ٥٩.

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا﴾ النساء/٨٠

﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ النساء/١١٥

له وته‌كانی مامۆستا ناصر ده‌رباره‌ی فه‌رمووده‌و به‌ گشتی (سوننه‌ت):

+ كتاب و سوننه‌ت دوو بنه‌مان بۆ (فیقهـ)، ئه‌مه‌ ڕوونه‌و كه‌س گومانی تێدا نیه‌، مه‌گه‌ر كه‌سێك له‌ بیركردنه‌وه‌و عه‌قیده‌یدا تووشی موصیبه‌تێكی گه‌وره‌ بووبێت.

+ فه‌رمانێك كه‌ له‌ناو (كیتاب)دا نه‌بێت، به‌ڵام وه‌ك (سوننه‌ت) له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا (علیه السلام)ه‌وه‌ ده‌ربكه‌وێت، چ كرده‌یی، چ گوفتاریی، په‌یڕه‌وكردنی واجبه‌.

+ له‌ ڕووی مه‌فهومه‌وه‌ (حه‌دیث) خواییه‌و هه‌روه‌ك قورئان په‌یڕه‌وكردنی واجبه‌.

+ هیدایه‌تی به‌شه‌ر پێویستی به‌ كیتابی خوا - قورئان- و (سوننه‌ت)ه‌. (سوننه‌ت) عباره‌ته‌ له‌ چۆنییه‌تی جێبه‌جێكردنی عه‌مه‌لیی و به‌رجه‌سته‌كردنی (كیتاب) له‌ لایه‌نه‌كانی ژیاندا.

+ سوننه‌ت یانی: ڕه‌وش و ڕێوشوێنی پێغه‌مبه‌ری خوا كه‌ جیاواز نیه‌ له‌ قورئان و ئه‌ویش پیاده‌كردنی قورئانه‌. وه‌ك نه‌خشه‌یه‌ك بۆ بینایه‌ك كه‌ له‌سه‌ر كاغه‌ز داده‌ڕێژرێت، دواتر ئه‌ندازیارێك دێت به‌ پێی ئه‌و نه‌خشه‌یه‌، بیناكه‌ دروست ده‌كات.

+ فه‌رمووده‌یه‌ك (بوخاری)و (موسلیم) به‌ یه‌كه‌وه‌ ڕیوایه‌تی بكه‌ن، زۆر موعته‌به‌ره‌و له‌ فه‌رموده‌ صه‌حیحه‌كانه‌.

(له‌م كتێبه‌دا سه‌رچاوه‌كانی ئه‌م بۆچوونانه‌ی مامۆستا ناصر دیاری كراون).




بۆ چاپ و بڵاو كردنه‌وه‌
نرخ: ٣٠٠٠